# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله له مافی السموات ومافی الأرض وله الحمد فی الأولي وفي الآخره وله الحكم وإليه ترجعون وصلى اللّه على نبينا محمد الأمين وعلى آل وأصحابی.

أما بعد. پەیداکردنی عیلم بۆ ئەهلی عیلم ئاسان نییە گەرچی ئەمڕۆ الله منەتی کردووە بەسەرمانەوە و هەندێک شتی بۆ ئاسان کردووین و دەستکەوتنی عیلمی شەرعی هەمووی لەسەر حیفظێکی بەهێز وەستاوە. واتە سەلوف ڕەحمەتی اللەیان لێبێت ئەهلی عیلمی وا هەبووە یەک مانگ ڕێگای بۆ فێربوون بڕیووە، واتە سەفەر و سەفەر. رسول الله ﷺ دەفەرمووێت: (قطعة من العذاب)[١]. واتە بەشێکە لەئازار.

کەواتە سەلەف بۆ فێربوونی عیلم زۆر ئازاریان چەشتووە تا توانیان چرایەکمان بۆ داگیرسێنین. رسول الله ﷺ لەچەند فەرموودەیەکی

---

١ صحيح مسلم

صەحیحدا دەفەرموویّت: (خيركم قرنى ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم).

بەڵێ ئەم سێ قەڕنە و قەڕنی دواتر بە ئازاری زۆر سەخت و ناڕەحەتی و شەونخونی توانیان چرایەک بۆ ئێمە جێبێڵن، واتە ڕێگای نا ڕوشنیان بۆ ڕوشنکردووینەوە. بەڵێ باشترین بوون بە قەول و عەمەل، گەر سەلەف نەبوایە و ماندووبوون و شەونخونی هاوەڵان نەبوونایە نە "نافع" و "ابن المسيب" و "ابن شهاب" و "عروه و مالك" و "شافعی" و "أحمد" و "اسحاق" و "ابو زرعه" و "يحيى بن سعيد" و "ابن المدينى" و "ابن معين" نەدەبوون، گەر ئەمانیش نەبوونایە نە "بخاری" و نە "أحمد" و نە "مسلم" ونە "ابى داوود" و نە "ترمز" و هاوشێوەکانیان نەیان دەتوانی چرامان بۆ هەڵبکەن ڕەحمەتی الله بەبەفراوانی بڕژێت بەسەر ئەم ئیمام و تابعییە بەرز و بەڕێزانە آمین.

لە "صحيح بخاری"دا (كتاب الجهاد والسير) رسول اللّٰه ﷺ دەفەرموویّت: (يأتى عليكم الزمان). سەردەمێکتان بەسەردادێت جیهاد دەکەن و پێتان دەڵێن: (هل فيكم أصحاب النبى)؟ ئایا هاوەڵانی پێغەمبەرتان لەگەڵە؟ دەڵێن بەڵێ، ئنجا فەتحی دەکەن. ئنجا سەردەمانێک دێت پێتان دەڵێن (هل فيكم صحب أصحاب النبى)؟ ئایا هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەرتان لەگەڵە؟ دەڵێن بەڵێ، ئنجا فەتح دەکەن و دواتر

سەردەمێکی تر دەڵێن (هل فيكم صحب صاحب اصحاب النبی)؟ ئایا هاوەڵی هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەرتان لەگەڵە؟ دەڵێن بەڵێ، فەتحی دەکەن. واتە هاوەڵان و تابعین و تابعی تابعین ڕەحمەت و ڕەزایی الله بڕژێت بەسەریان. بۆیە (خير القرون) بوون، شەونخوونی و ساردی و گەرمی ڕێگای سەلەف بووە. تا دانە بەدانە فەرموودەیان بۆ ئێمە کۆکردووەتەوە، کەچی ناتوانین  و هەر بشیانخوێنینەوە!

سەلەف بۆ بەدەستهێنانی عیلم شەو ڕۆژیان خستبووە سەریەک بە ماڵ و بەگیان و بە لەبەرکردنیش هەوڵیاندەدا و فێری عیلم دەبوون، ئەوەتا الحمدلله ئێمە نەسەرما و نەگەرمای دووری ڕێگای سەخت و سەفەری پڕ ئازارمان نەماوە. تەنها لەبەرکردن (حفظ) نەبێت ئەی بۆ نایکەین؟!

بۆیە من پشتیوان بە الله هەوڵدەدەم پووختەیەک لە یەکێک لە گرنگترین عیلمەکانی سەلەف و ئەم دینە دوای قورئان باسبکەم ئەمیش (علوم الحديث)ە، دەمەوێت بەرچاو ڕوونی بخەمە بەرچاوی خوێنەر تا کەمێک لەمێژوو و سەرەتا و کۆتای ئەم عیلمە بزانێت و ڕێگاکانی فێربوونیش بإذن الله تعالى.

**✍لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی**

**٢٦ی سەفەری ١٤٤١ کۆچی**

**بەرامبەر بە ٢٠١٩/١٠/٢٥ زاینی**

# بەندی یەکەم: مێژوو و زانستی فەرمووده.

## بەشی یەکەم: دەروازەیەک بۆ زانستی فەرمووده.

لەسەرەتا دەمەوێت پووختەیەک لەسەر عیلمی حەدیث بنووسم، پشتیوان بە الله کە لەسەرەتای ئەم عیلمە چۆن و چی بووە تاوەکو گەشەسەندنی لەگەڵ سەدەکان و پیاوانی ئەم ڕێگایە و ناساندن و شارەزابوون لێیان.

(حدیث یان سنە) وەک مەعلومە قورئان ئنجا سونە سەرچاوەی دووەمی شەرعە لەدینی ئیسلام و تەواوکەری واجباتەکانی نێو قورئانە کە بەکورتی هاتوون و لە سونەت تەفاصیلی دەداتێت، بەڵگەکانی چین؟ چونکە کۆمەڵانێکی زۆر هەن تائێستاش ناویان لەخۆناوە قورئانی کار بە فەرموودە ناکەن یان هەندێک مەسائیل هەیە کە بە عەوامی خەڵک دەڵێن، بۆنمونە لەباسی دەجال و مەهدی علیە سلام دەڵێن ئەگەر گرنگ بوایە لەقورئان باسدەکرا یان بۆچی لەقورئان نەهاتووە؟

وەک قال تعالی: (وما ینطق عن الهوی، إن هو إلا وحي یوحی)

ئەمەشیان هەر وەحییە لەلایەن اللهوەیە لەڕێگەی وەحی بۆ هاتنەوە. بۆیە الله پێمان دەفەرمووێت قال الله تعالی: (یا أیها الذین آمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول)

فەرمان بە ئیماندارکراوە شوێن الله بکەوێت و شوێن ڕەسولەکەی بکەوێت. بۆیە پێمان دەفەرمووێت قال الله: (ما آتاکم الرسول فخذوه وما نهاکم عنه فانتهوا)

ئنجا دێتە سـەرئەوەی کە شتێک ئەو پێی ووتین و پێیداین وەری بگرین و نەهیکردنیشی لێی دەبێت لێی دووربکەوینەوە یان قال الله تعالی: (وما کان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضی الله ورسوله أمرا أن یکون لهم الخیرة من أمرهم)

ئەمانە بەڵگەی موطلەق و موقنیعن کە لە قورئاندا هاتووە لەسەرئەوەی (سنەت) فەرموودەش هەر وەحییە و سەرچاوەی دووەمی ئەم دینە پاکەیە. لەبەشەکانی داهاتوو دێینە سەر باسەکانی سەرەتای ئەم عیلمە و قۆناغەکانی.

## بەشی دووەم: ئەم زانستە لەسەردەمی رسول الله ﷺ چۆن بوو؟

پێویستە بزانرێت سەرەتای ئەم عیلمە چۆن بووە چونکە زانینی سەرەتا یەکێکە لەهۆکارەکانی تێگەیشتنی ئێستا. زانایان لە سەلەف و خەلەف[1] لەکاتی باسی ئەم عیلمە باسی ئەوەیان کردووە لەسەرەتا چۆن بووە، دواتر چی لێهاتووە تاوەکو ئەمڕۆ. وەک "خطیب البغدادی" لە کتێبێکی بەناوی (تقید العلم) دەیان فەرموودە و قەول و (آثر) هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم تاوەکو هاوەڵان و ئنجا تابعین و تابعی تابعین بەسەنەدەوە باسدەکات تاوەکو سەردەمی خۆیی، چونکە دەبێت بزانرێت ئەم عیلمە وەک قورئان نەبووە، بەڵکو قوناغ بەقۆناغ پەرەی سەندووە وەک دارێک ووردە ووردە لق و پۆپی زیاتر لێبووەتەوە، چۆن؟

وەک لەسەرەتا نوسینەوەی فەرموودە نەبوو تەنیا لەبەرکردن (حفظ) هەبووە. ئنجا نوسینەوە پەرەی سەند ئنجا (مسند) و (مصنف) و (موطأ) و ئنجا (صحیح) و (سنن)ەکان پەیدابوون ئەمەش دوو تا سێ سەدەی خایاند. دوای ئەمانەش ئنجا عیلمی (علل) و (جرح تعدیل) و تایبەت بەزانین و ناسینی پیاوانی حەدیث و پەیدابوو. ئنجا پەرەسەندنی (تحقیقات) و (تخریجات) و (تصحیح) و (تضیف)، واتە هێندە وردە

---

1- خەلەف : زانایانی شوێنکەوتەی مەنهەجی سەلەف لە ئەثری صحیح رحمه الله

عیلمێکی کەوا لەنێو ئەم عیلمە چەندان عیلمی تری ووردی لێبووەتەوە وەک بڵێیت لەنێو وورد ووردتری لێبووەتەوە. گرنگە بۆ طالب العلم زانین و شارەزابوون لەم شتانە، تاوەکو لەوەبگات ئەم فەرموودەیی ئەمڕۆ لەبەردەستییەتی وەک شتێکی ئامادەکراو وایە بۆی لەماوەی زیاتر لە هەزارو دووسەد ساڵ.

قال رسول الله ﷺ: عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (لا تَكْتُبُوا عَنِّي وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ وَحَدِّثُوا عَنِّي وَلا حَرَجَ ...)[١].

واتە شت لەمنەوە مەنووسنەوە هەریەکێک شتێکی غەیری قورئانی نوسیووە با ڕەشی بکاتەوە و لەمنەوە بیگێڕنەوە هیچ کێشە نییە...

ئیمامی "نووی" لەشەرحی "مسلم"دا دەڵێیت:

قَالَ الْقَاضِي: كَانَ بَيْن السَّلَف مِنْ الصَّحَابَة وَالتَّابِعِينَ اِخْتِلاف كَثِير فِي كِتَابَة الْعِلْم، فَكَرِهَهَا كَثِيرُونَ مِنْهُمْ، وَأَجَازَهَا أَكْثَرهمْ، ثُمَّ أَجْمَعَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى جَوَازهَا، وَزَالَ ذَلِكَ الْخِلاف.

لەنێوان سەلەف لە هاوەڵان و تابعین جیاوازی زۆر لەنوسینەوەی زانست واتە فەرموودە هەبووە، بەشێک پێی ڕازی نەبوون و زۆرینەی

---

١ رواه مسلم وصحيحه

لەدوای هاوەڵان ڕێگەیان پێداوە و تا ڕێگەدانیان بەجائیز دانا لەگەڵ هەندێک جیاوازی.

لە کتێبی (تقيد العلم)ی (خطيب البغدادی)دا هاتووە:

لە "عطاء بن يسار" , لە "أبي سعيد الخدري"، دەڵێت: استأذنت رسول الله ﷺ، أن يأذن لي أن أكتب الحديث، فلم يأذن لي وقال البخاري: فأبى أن يأذن لي.

واتە "أبي سعيد الخدري" دەڵێت داوام کرد فەرموودە بنوسمەوە، بەڵام ڕێگەی پێنەدام.

لەهەمان کتێبی "خطيب البغدادی: "

عن أبي هريرة، قال: خرج علينا رسول الله ﷺ، ونحن نكتب الأحاديث، فقال: ما هذا الذي تكتبون؟ قلنا: أحاديث سمعناها منك. قال: أكتابا غير كتاب الله تريدون؟ ما أضل الأمم من قبلكم إلا ما اكتتبوا من الكتب مع كتاب الله. قال أبو هريرة فقلت: أنتحدث عنك يا رسول الله؟ قال: نعم، تحدثوا عني ولا حرج فمن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار.

واتە رسول الله ﷺ ڕۆژێک هات و ئێمەش فەرموودەمان دەنووسییەوە فەرمووی: ئەوە چییە دەینوسنەوە؟ گوتمان ئەو فەرموودانەی لە تۆوە

گوێمان لێبووە. فەرمووی: ئایا کتێبێکی جگە لەقورئانتان دەوێت؟ هیچ شتێک گەلانی پێش ئێوەی گومڕا نەکردووە تەنیا ئەوە نەبێت کتێبی تریان جگە لە کتێبی اللەش دەنوسییەوە. ئەبوهڕیرە دەڵێت، ئایا لە تۆوە شت نەگێڕینەوە. فەرمووی: بیگێڕنەوە هیچ کێشە نییە و هەریەک درۆ بەدەمی مندا بکات با جێگەی لەنێو ئاگر خۆش بکات.

ئەمە لە بەشەکانی دواتر وردتر و زیاتر ڕوونی دەکەینەوە پشتیوان بە الله تعالی.

## بەشی سێیەم: سەرەتاکانی زانستی فەرموودە لە کەیەوە دەست پێدەکات؟

لەکاتی ژیانی رسول اللەوە. ئەوەی هەیە لەسەر سەرەتاکانی ئەم عیلمە، کاتێک رسول الله ﷺ لەژیاندا بووە هاوەڵە بەڕێزەکان زۆر خۆیان لەوە نەداوە بۆ نوسینەوەی فەرموودەکان، وەک چەندان فەرموودە و ئاثر هاتوون، کەوا نەهی لە نوسینی فەرموودە کراوە چونکە ترساون لەگەڵ قورئان تێکەڵ بێت، بەڵام ئەم باسە نوسینی فەرموودە بەموطڵەقی نەبووە، بەڵکو لە هەندێک ڕیوایەتدا هاتوو، وەک لە "صحیح مسلم" و

"صحيح بخاری"دا هاتووە، لەساڵی فەتحی مەککەدا رسول الله ﷺ وتار دەدات لەبارەی حەرامی شەڕ و جەنگ لە مەککەدا بەوەی لەسەرەتای خەلق حەرام بووە تەنیا سەعاتێک بۆ ئەو حەڵاڵکراوە و وەک خۆی لێهاتووە. ئنجا باس لە نەبڕینی دار و درەخت و گژوگیا و. لەکۆتایی یەکێک هەڵدەستێت دەڵێت: ئەی رسول الله بۆمی بنوسن ئەویش دەفەرمووێت: (اکتبوا لأبی شاه...).

یان لە "صحیح بخاری" واردە، رافع بن خدیج: قلت یا رسول الله إنا نسمع منك أشياء أفنكتبها؟ قال: اكتبوا ولاحرج.

رافع بن خدیج" بە رسول اللەم ووت ئێمە هەندێک شتمان لە تۆوە گوێ لێدەبێت، ئایا بینوسینەوە فەرمووی بینوسن و هیچ کێشەی نییە.

واتە لەقۆناغی سەرەتاکان بەدەگمەن نەبێت ڕێگە نەدراوە، بەڵام لەسەرەتاکان واتە پێش فەتحی مەککە چونکە ئیسلام بەتەواوەتی جێگیر نەبووە، بۆیە هەندێک هاوەڵ داوای نوسینەوەیان کرد، بەڵام لەترسی ئەوەی تێکەڵ نەبێت لەگەڵ قورئان نەهییان لێکراوە. بەڵام ڕێگەش دراوە لە هەندێک حاڵەت بەوەی بینوسنەوە، کەواتە ئەم عیلمە لەکاتی ژیانی زۆر لاواز بووە. ئەوەی هەبووبێت زیاتر هێزی لەبەرکردن بووە، واتە هاوەڵان زیاتر فەرموودەکانیان حفظ دەکرد وەک لە (صحیحین) واردە.

أبى هرێره" الله لێی ڕازی بێت گلەیی ئەوەی کرد لای رسول الله. فەرمووی یا رسول الله ﷺ من فەرموودە لەبیردەکەم ئەویش فەرمانی پێ دەکات کەوا پەڕۆیەک دابنێت و دووعای بۆ دەکات، ئنجا دەڵێت هەڵیگرەوە لەمڕۆوە یەک فەرموودەی لەبیر ناچێتەوە. هەروەها لە (تقید العلم)ی (خطیب البغدادی) هاتووە.

عن أبي نضرة، قال: قلنا لأبي سعيد: لو كتبتم لنا، فإنا لا نحفظ، قال: لا نكتبكم ولا نجعلها مصاحف، كان رسول الله ﷺ يحدثنا فنحفظ، فاحفظوا عنا كما كنا نحفظ عن نبيكم.

دەڵێت بە "أبو سعيد الخدرى"مان گوت گەر بۆت نوسیبباینەوە، فەرمووی نە بۆتان دەنوسمەوە نە دەهێڵم بیکەنە پەڕاو، وەک قورئان رسول الله ﷺ بۆی باسدەکردین و ئێمەش لەبەرمان دەکرد. ئێوە لەبەری بکەن وەک چۆن ئێمە لە پێغەمبەرەکەتانەوە لەبەرمان دەکرد.

هەروەها عبد الله بن عمرو بن العاصقال: كنت أكتب كل شيء أسمعه من رسول الله ﷺ أريد حفظه فنهتني قريش، وقالوا تكتب كل شيء سمعته من رسول الله ﷺ ورسول الله ﷺ بشر يتكلم في الغضب

والرضا؟ فامسكت عن الكتاب، فذكرت ذلك لرسول الله ﷺ فأومأ بإصبعه إلى فيه وقال: أكتب فوالذي نفسي بيده ما خرج منه إلا حق.

عبدالله بن عمر" دەڵێت: من هەموو شتێکم دەنوسییەوە کە لە رسول الله ﷺ گوێم لێ دەبوو ویستم لەبەری بکەم. قورەیش ڕێگریان کرد، گوتیان ئایا هەموو شتێک دەنوسییەوە کە گوێت لێبووە لە رسول الله ﷺ گوتیان خۆ ئەو مرۆڤە و قسە دەکات لەکاتی توڕەبوون و ڕەزامەندی. کتێبەکەم گرتە دەست بۆ رسول الله ﷺ و باسم کرد فەرمووی بە پەنجە ئیشارەی کرد و فەرمووی، بینوسە سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە نایەتە دەرەوە لەدەمم تەنیا حەق نەبێت.

ئەمە تایبەت بوو بەنوسینەوەی حەدیث لە ژیانی رسول الله ﷺ کەوا لاواز بووە لەحاڵەتی تایبەت نەبێت نەنوسراوە. لەسەرەتاکان جیاواز بـووە وەک لە پێش فەتح و دوای فەتح.

## بەشی چوارەم: ڕێگرتن لە نوسینەوەی فەرموودە لەلایەن هاوەڵانەوە.

باسکردن بەشێوەی (تسلسل) یەک بەدوای یەک گرنگی خۆی دەبێت و بۆئەوەیە تا بزانرێت سەرەتا و کات و چۆنیەتی ئەم عیلمە چۆن بووە.

لە بەشەکانی پێشودا لە (تدوين الحديث) نوسینەوە. ئێستا گەیشتین بە سەردەمی دوای وەفاتی رسول الله ﷺ لەسەردەمی (خلفاء الراشدين) لەبارەی نوسینەوەی فەرموودەکانەوە، ئەوا دەبینیت نوسینەوەی فەرموودەیان پێناخۆش بووە بەگشتی. گەرچی هەندێک جار نوسیویانە، وەک لە (بحوث تأريخ سنه مشرف) و (تذكرة حفاظ ذهبى و حاكم) و چەند پێشەوایەکی تر کەوا، (جمع أبو بكر الصديق رضي الله عنه خمسمائة حديث ثم أحرقها).

دەڵێت ئیمامی "أبو بكر" الله لێی ڕازی بێت پێنج سەد فەرموودەی کۆکردەوە و سوتاندی لەترسی ئەوەی نەوەکو خەڵک واز لەقورئان بهێنێت.

هەروەها هاتووە "عمر بن الخطاب" رضي الله عنه یەک مانگ ئیستخارە و ئیستشارەی کرد، بۆئەوەی فەرموودە بنوسرێتەوە، بەڵام گوتی من ویستم حەدیث بنوسمەوە و بیری قەومانێکم هاتەوە کە پێش ئێوە

هەستاون بەنووسینەوە. بۆیە ڕوویان لەکتێبی الله وەرگێڕاوە، بۆیە سوێند بە الله من کتێبی الله کە مەبەستی قورئانە بەهیچ نادەم و ناگۆڕمەوە. هۆکارەکەش ترسانی بووە نەوەک خەڵک وایان لێبێت. گەرنا وتەکانی رسول اللەیان لەسەر چاوان داناوە.

استشار عمر بن الخطاب رضي الله عنه الصحابة في تدوين الحديث، ثم استخار الله تعالى في ذلك شهرا ثم عدل عن ذلك وقال: "إني كنت أريد أن أكتب السنن، وأني ذكرت قوما كانوا قبلكم كتبوا كتبا فأكبوا عليها وتركوا كتاب الله، وأني والله لا أشوب كتاب الله بشيء أبدا."

هەروەها عن أبي مالك، عن أبي الشعثاء المحاربي، أن ابن مسعود كره كتاب العلم.

عبدالله بن مسعوود" الله لێی ڕازی بێت یەکێکە لە (سابقين الأولين) نوسینەوەی پێناخۆش بووە.

هەروەها عن أبي بردة قال: كان أبو موسى يحدثنا بأحاديث، فنقوم أنا ومولى لي فنكتبها، فحدثنا يوما بأحاديث فقمنا لنكتبها، فظن أنا نكتبها، فقال: أتكتبنان ما سمعتما مني؟ قالا: نعم، قال: فجيئاني به، فدعا بماء فغسله، وقال: احفظوا عنا كما حفظنا.

أبی بردە" دەڵێت "أبو موسی" فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوە، من و خزمەتکارێک ویستمان بینوسینەوە ڕۆژێک هەندێک فەرموودەی گێڕایەوە، ئێمەش ویستمان بینوسینەوە، وایزانی ئێمە دەینوسینەوە. گوتی ئایا ئەوەی لە من گوێتان لێ دەبێت دەینوسنەوە. وتمان بەڵێ. فەرمووی بیهێنن داوای ئاوی کرد و شوشتیەوە و گوتی لە ئێمەوە لەبەری بکەن هەروەک چۆن ئێمەش لەبەرمان کردووە.

بەشێکی تری زۆر لەهاوەڵان لەسەرەتای دوای وەفاتی رسول الله ﷺ نوسینەوەی پێناخۆش بووە، ترساون لەوەی خەڵک مەشغوڵبێت پێوەی و واز لەقورئان بێنن.

بەڵام تەنانەت "أبو بکر" و "عمر" و "علی" الله لەهەموویان ڕازی بێت، جار جار نوسینەوەیان ڕێگە پێداوە و نوسیووە. کەواتە تا ئەم سات ئەم عیلمە دەستی پێنەکردبوو و پەرەی نەسەندبوو.

## بەشی پێنجەم :گرنگی و پلەوپایەی فێربوونی ئەم عیلمە.

لەم بەشەدا تێشک دەخەینە سەر گرنگی هەوڵدان بۆ فێربوونی حدیث. لەکتێبی (شرف أصحاب الحديث)ی "خطيب البغدادی" بە سەنەد لە "عبدالله بن مسعوود" و "أنس بن مالك" و "إبن عباس" هێناویەتی لەبارەی:

عن عبد الله، قال قال رسول الله ﷺ: (من حفظ على أمتي أربعين حديثا، ينفعهم الله بها، قيل له: ادخل من أي أبواب الجنة شئت)

عن أنس، قال: قال رسول الله ﷺ: (من حفظ على أمتي أربعين حديثا من أمر دينهم، بعثه الله يوم القيامة فقيها عالما).

عن ابن عباس، قال: قال رسول الله ﷺ: (من حفظ على أمتي أربعين حديثا في السنة كنت له شفيعا يوم القيامة).

کۆکراوەی هەرسێ ڕیوایەتەکە ئەوەیە رسول الله ﷺ دەفەرمووێت هەریەک لە ئوممەتەکەم چل فەرموودە لەبەربکات لە ئەمری دین. ئەوا لەهەر دەرگایەک بیەوێت دەچێتە بەهەشتەوە، یان من بۆی دەبمە تکاکار لەقیامەت یان بە زانا و تێگەیشتووی دین زیندوودەکرێتەوە.

ئیمامی "نووی" له موقەدیمەی کتێبی (أربعون نووی)دا دەڵێت لەبارەی ئەم فەرموودەیە:

أما بَعْدُ: فقد رُوِّينَا عَنْ عَليٍّ بن أبي طالب، وعبدِ الله بنِ مَسعودٍ، ومُعاذِ بنِ جَبَلٍ، وأبي الدَّرْداءِ، وابنِ عُمَرَ، وابنِ عباسٍ، وأنسِ بنِ مالِكٍ، وأبي هُرَيرةَ، وأبي سعيدٍ الخُدْرِيّ رضي الله عنهم من طُرُقٍ كثيراتٍ بِرواياتٍ متنوِّعاتٍ أنَّ رسول الله ﷺ قال: (مَنْ حَفِظَ على أُمَّتي أَربعينَ حديثاً من أمْر دينِها بَعَثَهُ الله يومَ القيامةِ في زُمْرةِ الفُقَهاءِ والعُلماءِ)[١].

وفي روايةٍ: (بَعَثَهُ اللهُ فَقِيهاً عالماً).

وفي روايةِ أبي الدَّرْداءِ: (وكُنتُ له يومَ القيامةِ شافعاً وشَهيداً).

وفي روايةِ ابنِ مَسعودٍ: (قيلَ له: ادخُلْ مِن أيِّ أبوابِ الجنةِ شِئتَ).

وفي رواية ابن عُمَر: (كُتِبَ في زُمْرةِ العُلماءِ وحُشرَ في الشهَداءِ).

کەوا لەچەندان هاوەڵی بەڕێز ڕیوایەتکراوە وەک "علي بن أبي طالب"، و"عبد الله بن مسعود"، و"معاذ بن جبل"، و"أبي الدرداء"، و"ابن عمر"، و"ابن عباس"، و"أنس بن مالك"، و"أبي هريرة"، و"أبي سعيد الخدري" رضي الله عنهم، هەریەک چل فەرموودە لەبەربکات لە ئەمری دیندا

---

١ رواه البيهقي

زیندوودەکرێتەوە لەگەڵ کۆمەڵی زانا و تێگەیشتوان یان وەک زانا یان من دەبمە تکاکار بۆی یان پێی دەڵێن لەهەر دەرگایەک دەتەوێت بچۆ ژوورەوە. دەشڵێت زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی فەرموودەیەکی لاوازە، گەرچی بەرێگای زۆر جیاواز هاتووە، بەڵام لەبەرئەوەی لە (فضائلی أعمال)ە و دەڵێت زانایان کۆکن کەوا فەرموودەی لاواز لە (فضائلی أعمال) کاری پێ دەکرێت کەواتە گرنگی خۆیی هەیە.

فەرموودەی رسول الله ﷺ کە لە"بخاری"دا هاتووە (لیبلغ الشاهد الغائب). واتە ئەوانەی ئامادەن بیگەیەنن بەوانەی لێرە نین بەواتای تر ئەم عیلمە بگوازنەوە لە ئێوە بۆ چینی دوای خۆتان.

## بەشی شەشەم: چەند چینێکی ئاماژە بۆکراو لە فەرموودەکاندا.

١. وەصیەتی پێغەمبەر.
٢. غورباء.
٣. ٧٣ فرقە کێن؟

لەدرێژەی باسی زانستی فەرموودە کە بەشێوەی جیاواز و سادە باسی دەکەم باسی چەند چینێک دەکەم بزانین کێن؟

**١. وەصیەتی رسول الله ﷺ:**

لە "سنن إبن ماجه"دا هاتووە لە "أبی سعید"وە رضی اللّه عنه.

سیأتیکُم أقوامٌ یطلبونَ العِلمَ فإذا رأیتُموهم فقولوا لَهُم مَرحبًا مَرحبًا بوصیَّةِ رسولِ اللَّهِ ﷺ واقْنوهُم قلتُ للحَکَمِ ما اقْنوهُم قالَ علِّموهُم.

واتە کاتێک دێت کەوا کۆمەڵانێک دێن بۆ فێربوونی عیلم، پێیان بڵێن بەخێربێن، بەخێربێن بۆ وەصیەتی رسول الله ﷺ و (اقنوهم) واتە فێریان بکەن.

لەکتێبی (شرف أصحاب الحدیث)ی "خطیب البغدادی"دا هاتووە، بەسەنەدێک لە "أبی سعید الخدری" رضی اللّه عنه، کاتێک گەنجێکی بدیبایە لە مەجلیسێک، پێی دەگوت بەخێربێیت بۆ وەصیە. رسول الله ﷺ وەسیەتی بۆ ئێمەکردووە ڕێزتان بگرین لە کۆڕ و ئنجا فێرتان بکەین، چونکە ئێوە شوێنگرەوەی ئێمە و ئەهلی فەرموودەی دوای ئێمەن.

حدثنا أبو هارون العبدي، عن أبي سعيد الخدري، أنه كان إذا رأى الشباب قال: مرحبا بوصية رسول الله ﷺ، أوصانا رسول الله ﷺ أن نوسع لكم في المجلس، وأن نفهمكم الحديث. فإنكم خلوفنا، وأهل الحديث بعدنا.

کەواتە فێربوونی عیلم و فەرموودە یەکێکە لەوەسیەتەکانی رسول الله کە داوای لە هاوەڵانی کردووە ڕێزیان بگرن و فێریان بکەن کە دواتر وای لێهات لە ڕۆژهەڵات (مشرق) و ڕۆژئاوا (مغرب) چینێکی زۆر بەرەو ئەم وەسیەتە بەڕێکەوتن.

**٢. غرباء.**

ئەو فەرموودەیەی کە بەشێکی زۆر لە پێشەوایانی ئوممەت لەچەندان هاوەڵ و بەچەندان شێوەی جیاواز هاتووە وەک "مسلم" و خاوەن (سنن)ەکان.

إن الإسلام بدء غريب وسيعود غريب فطوبى للغرباء.

واتە ئیسلام بە غەریبی و نامۆیی سەریهەڵدا و بەنامۆی و غەریبیش دەگەڕێتەوە لەڕیوایەتێکدا دەڵێت (قيل ومن غرباء).

فەرمووی ئەوانەی سوننەتی من زیندوودەکەنەوە و هەندێک دەڵێن (أصحاب الحديث)ن وەک لە (شرف أصحاب الحديث)دا هاتووە.

**٣. (٧٣) فیرقە.**

یەکێکی تر لەو فەرموودانەی کە هاتووە بە چەندان شێوەی جیاواز لەبارەی ئەوەی ئوممەتی ئیسلام دەبێتە حەفتاو سێ فیرقە لەم حەفتاو سێیە تەنیا یەکێکی ڕزگاری بووە.

کۆکراوەی ڕیواتەکان بەم شێوەن یەهود واتە جوولەکە دابەش بووە حەفتاو یەک فیرقە. نەصارا واتە گاور دابەش بوون بۆ حەفتاو دوو فیرقە و ئوممەتی من دەبێتە حەفتاو سێ فیرقە هەر هەموویان بۆ نێو ئاگرن. تەنها یەک کۆمەڵەی ڕزگاری بووە لە ئاگر کە پێیان دەڵێن کۆمەڵی ڕزگاربوو (فرقە الناجيه). لەڕیوایەتێک دەڵێت گوتیان کێن؟ فەرمووی (الجماعه).

لەڕیوایەتی تر پێیان گوت کێن، فەرمووی ئێوەن ئەی شوێنکەوتوانی سونەت یان حەدیث. "خطيى بغدادی"ش بە سەنەد لە ئیمامی "احمد"ەوە لەبارەی ئەم کۆمەڵە ڕزگاربووە لە وەڵام دەڵێت گەر "أصحاب الحديث" نەبن ئەی کێن!

حدثني عبد الله بن أحمد بن علي السوذرجاني بأصبهان، قال سمعت - عبد الله بن أبي القاسم، يقول سمعت أحمد بن محمد بن روه، يقول: حدثنا إبراهيم بن محمد بن الحسن، قال: حدثت عن أحمد بن حنبل، وذكر، حديث النبي ﷺ: (تفترق الأمة على نيف وسبعين فرقة، كلها في النار إلا فرقة). فقال: إن لم يكونوا أصحاب الحديث، فلا أدري من هم. (شرف أصحاب الحديث للخطيب البغدادى).

ئنجا (أصحاب الحديث) ئەوانەن كە هەوڵى فێربوونى ئەم عیلمە دەدەن و ئەم سوننەتانە زیندوودەكەنەوە كە مردوون.

ئەم تەعریفانە بە موطڵەقى نیین، بەڵكو استثنائى تێدایە، واتە بەشێوەى گشتى نیین، بەڵكو فراوان تریش دەبێت، بەڵام لەم فەرموودانە بۆمان دەردەكەوێت طەڵەبى علوم الحديث چەند گەورە و پڕ ئەجرە.

## بەشى حەوتەم: ئایا طائیفەى (منصورە) كێن؟

لەم زانستە لە تایبەتمەندى و گرنگى ئەم عیلمەین من، بۆیە ئەم قەول و بەشانە باس دەكەم تابزانرێت عیلمێكى چەندە. مەزن و پڕ ئەجرە ئەم فەرموودەى كە بەچەندان ڕیواتەت و لەچەندان هاوەڵى بەڕێزەوە

ريوايەتكراوە بە صحيحيش، بەم لەفزانە و ئەم فەرموودە من دابەشی دوو چينی دەكەم چونكە لەفز و ريواتەكان واهاتوون.

**١. ئەهلی علم و حديث.**

قال رسول الله ﷺ: (لاتزال طائفة من أمة ظاهرين على الحق).

(لاتزال طائفة من أمة منصورين على الحق).

(لايضرهم من خذلهم) و لەزۆرينەی ڕيوايەتەكان دەڵێت: (حتى قيام الساعە يان تقوم الساعە).

**لە يەكەميان بەشێكی زۆری لەپێشەوايانی گەورەی ئوممەت وەك:**

- إمامی أحمد بن حنبل
- إمام بخاری
- إبن مبارك
- على بن المدينى
- يزيد بن هارون و چەندان زانای تر دەڵێن مەبەست پێی ئەهلی عيلم و حەديثە و هەندێكيان وەك (أحمد بن حنبل) و (يزيد بن هارون) دەڵێن گەر ئەوان نەبن نازانين كێن؟[١]

١ سەرچاوە/ (شرف أصحاب الحديث) لل"خطيب البغدادى".

**٢. ئەهلی جيهاد و مجاهيدان.**

لەچەند ريوايەتێكی تريش بەمشێوانە هاتوون (لايزال) يان (تزال طائفة من أمة يقاتلون) و لە ڕيوايەتێك دەفەرمووێت: (حتى يقاتل آخرهم الدجال).

---

- **رسول الله ﷺ دەفەرموێ** بەردەوام دەستەيەك لەئوممەتەكەم دەجەنگن و كوشتار دەكەن لەسەر حەق لەناوتان ديارن تا ڕۆژی قيامەت. لا تزال طائفة من آمتى يقاتلون على الحق ظاهرين الى يوم القامة.(صحيح مسلم:٢٧٤)
- **إمامی أحمد كوڕی حەنبەل** لە عەقيدەكەيدا دەفەرموێت:هەروەها **جيهاد بەردەوامە** هەر لەوكاتەی الله تعالى محمدی ناردووەﷺ هەتاكو كۆتا دەستە كە دژی دەجال دەجەنگن ،خراپەی خراپەكارێك هيچ زيانێكيان پێ ناگەيەنێت. (طبقات الحنابلة٢٩٥/٢)

**دووەمیان (قتال، یقاتلون، مجاهدون، مجاهدان).**

لە بەشێکی تری ریوایەتەکان فەرموودەکان وشەی (قتال-یقاتلون) (لاتزال طائفة من أمة یقاتلون علی الحق).

کەواتە بەشێکی تری فەرموودەکە تایبەتە بە (جیهاد في سبیل الله تعالی). بەڵێ بێگومان یەکێک لەگەورەترین کار دوای ئیمان تێکۆشانە لەپێناو اللەدا.

چەند فەرموودەیەک لەسەر جیهاد و گرنگیەکەی لە "صحیح بخاری" لە کتێبی (المغازی):

١- لە "إبن مسعود" رضی اللّٰه عنه دەڵێت پرسیارم کرد لە رسول الله کە چی کارێک چاکترینە؟ فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆی. وتم دوای ئەو فەرمووی چاکەی دایک و باوک دواتر فەرمووی (جیهاد في سبیل الله).

---

⦿ **ابن عدی رحمه الله بە سەنەدی خۆی لە أحمد بن حنبل** دەگێڕێتە**وە کە ووتوویەتی**: گوێ بیستی سفیان بن عوینە بووم دەیووت: گەر خیلافتان تێکەوت لە شتێکدا ئەوا سەیری ئەهلی جیهاد بکەن بزانن ئەوان لەسەرچین ،چونکە الله تعالی فەرموویەتی وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا واتا ئەوانەی لەپێناو ئێمە جیهاد ئەکەن ڕێنماییان ئەکەین بۆ ڕێگاکەمان .
(الکامل فی ضعفاء الرجال 185-1)
(سورة العنکبوت-69)

⦿ **شیخ الإسلام ابن تیمیة** بە پێشت بەستن بە ئەثری سەلەف دەفرموێ: هەر بۆیە **ئێمام عبدالله بن المبارک و احمد بن حنبل و جگە لەوانیش** ووتووانە: گەر خەڵکی خیلافیان تێکەوت لە شتێکدا ئەوا سەیری سەنگەرنشینەکان بکەن بزانن لەسەر چین لەم شتەدا ، چونکە حەق لەگڵ ئەواندایە ،چونکە الله دەفەرمووێ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا واتا ئەوانەی لەپێناو ئێمە جیهاد ئەکەن ڕێنماییان ئەکەین بۆ ڕێگەکەمان. **(مجموع الفتاوی ٢٨ /٤٤٢)**

**قال شیخ الإسلام ابن تیمیة** رحمه الله تعالی: "ولهذا کان الجهاد موجبا **للهدایة التي هي محیطة بأبواب العلم، کما دل علیه قوله تعالی**: {والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سبلنا} [العنکبوت: 69]، فجعل لمن جاهد فیه هدایة جمیع سبله تعالی؛ ولهذا قال #الإمامان_عبد_الله_بن_المبارک و #أحمد_بن_حنبل وغیرهما: إذا اختلف الناس في شيء، فانظروا ماذا علیه أهل الثغر فإن الحق معهم؛ لأن الله یقول: {والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سبلنا} [العنکبوت: 69]"

٢-  له فەرموودەیەکی تر له "أبی هریره" دەڵێت:

یەکێک پرسیاری له رسول الله ﷺ کرد کارێکم پێ بڵێ وەک جیهاد بێت؟ فەرمووی: نییه و نایدۆزیەوە. ئنجا فەرمووی: ئایا تۆ دەتوانیت کاتێک موجاهید دەچێتە دەرەوە بچیته مزگەوت نوێژ بکەیت دانەنیشیت و بەڕۆژوو بیت نەیشکێنیت گوتی جا کێ ئەمه دەتوانێت؟

٣-  له فەرموودەیەکی تر له "ئەبی سعید"ەوە رضی الله عنه، دەڵێت به رسول الله گوترا کێ باشترینی خەڵکە؟ فەرمووی: ئیماندارێک بەماڵ و نەفسی تێبکۆشێت له پێناو الله و دواتر ئیماندارێک لەدۆڵێک له دۆڵەکان لەخوا دەترسێت و خەڵک لەشەڕی دووره.

فەرموودە گەلێک زۆره لەسەر پلەی جیهاد و مجاهیدان، بەڵام ئەمه کافییه. کەواته بەپێی ئەم فەرموودانه کۆمەڵی براوه و سەرکەوتوو لەدوو چین و دوو کۆمەڵ زیاتر نین و نابن.

١.  ئەهلی عیلم و فەرموودەن و علوم شەرعی بەگشتی.
٢.  مجاهید في سبیل الله.

بۆیه خۆت بەراوردبکه بزانه کامیانت تێدا هەیه بەڕاستی گەرنا لەئیمانت بترسه.

## بەشی هەشتەم: جۆرەکانی ئەم عیلمە چین؟

لەم بەشەدا تیشک دەخەمە سەر جۆرەکانی ئەم عیلمە. عیلمی حەدیث دابەشی دوو جۆر دەبێت ئەوانی:

١. علمی حدیث روایة.
٢. علمی حدیث درایة.

### ١. علمی حدیث روایة.

ئەم عیلمە کە دەڵێین عیلم واتە لەناوەڕۆکدا چەندان لق و پۆپی تری لێدەبێتەوە. ئەم زانستە لە چی شتێک دەکۆڵێتەوە؟ لەوە دەکۆڵێتەوە کەوا ئەم فەرموودە لە چی شتێکەوەیە. لە رسول الله ﷺ ئایا

١- فعله
٢- قوله
٣- أحواله

واتە تەحقیقی موحەققین و موحەدثین لەسەر ئەم عیلمە لەوەدایە، ئایا (فعل)ە وەک رسول الله کارێکی کردبێت یان هاوەڵان کاتێک فەرموودەیەک ڕیوایەت دەکەن دەڵێن رأیت رسول الله ﷺ (یفعل ذلك). یان (ئەقوال)ی بێت، (قال رسول الله) یان (أن رسول الله قال) یان

(سمعت رسول الله ﷺ يقول). یان له (أحوال)، واته حاڵ که ئەمە پەیوەستە بەخودی رسول اللەوە ﷺ، وەک لایەنی خەلقی دروستکراوی و خولقی سیفەتی نمونە "أنس بن مالك" دەفەرمووێت (کان رسول الله أحسن الناس وأجود الناس). یان سیفەتی جوانی و باڵای درێژی و کۆرتی یان توڕەبوون و پێکەنینی ئەمانە هەمووی (أحواله).

## ٢. علمی حدیث درایة.

ئەم عیلمە لە بارودۆخی ڕاوی فەرموودە دەکۆڵێتەوە، ئایا قبوڵە یان ڕەدکراوەتەوە؟ کێ ڕیوایەتی کردووە؟ لەکوێوە؟ بۆنمونە لە "ترمزی"، ئنجا لە یەکێکی تر دواتر یەکێکی تر کە قبوڵکراو نییە یان ڕەدکراوە فەرموودەکانی ئەمەشیان دونیایەک ڕێچکە و لقی لێ دەبێتەوە دەیان مەرجی هەیە و زانایان دەیان کتێبیان لەسەر نوسیووە لەسەر ناسینی پیاوانی فەرموودە (رجال الحدیث). سودی چییە؟

سودەکەی زانینی ئەوەیە دوای لێکۆڵینەوە، ئایا قبووڵکراوە یان نا چونکە حوکمی شەرعی لەسەر بنیاتدەنرێت، واتە دەبێتە دین، بۆیە ئەم عیلمە هێندە وردە. زانایان هەریەکێکیان چوبێتنە نێوی تا مردن بەدەگمەن نەبێت دەرنەهاتووە و زۆر بە وردی لێیانکۆڵیتەوە و لەنێوان هەزاران فەرموودە، زانای وا هەبووە یەک فەرموودەی ڕیوایەتکردووە.

## بەشی نۆیەم: باشترین چینەکانی ئوممەت (طبقات صحابە و تابعین).

لەم بەشەدا کورتەیەک لە دابەشکاری چینەکان و گرنگیان دەخەینەڕوو پشتیوان بە الله. زانایان لە سەلەف و خەلەف گرنگیان داوە بەم باسە، ئەویش (طبقات) بەهۆی ئەم فەرموودانەوە کە بە صەحیحی هاتوون.

عن ابن مسعود رضي الله عنه أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ)[1].

ئەم فەرموودە بەچەندان ڕیوایەت هاتووە. لەم فەرموودەیەدا گرنگی و پلەو پایەی سەلەفمان بۆ دەردەکات. ئایا کێن باشترینەکانی ئوممەت کەوا رسول الله صلى الله عليه وسلم باسیانی کردووە.

### چینی یەکەم: باشترین چین چینی (صحابە).

هاوەڵە بەڕێزەکانی کەوا لەخزمەت رسول الله بوون و ئەویان بینیووە، هاوەڵان ئەمانەن کەوا پێغەمبەریان بینیووە و ئیمانیان پێهێناوە. بێگومان

١ روى البخاري: (٣٦٥١)، ومسلم: (٢٥٣٣)

ئەمانیش چەندان پلەو پایەیان هەیە، کۆمەڵێک لەیەکێکی تر چاکتر و پلەیان بەرزترە، بەڵام لەبەشەکانی تر باسیان دەکەم.

هاوەڵە بەڕێزەکانی وەک "أبو بكر"و "عمر" و "عثمان" و "علی" و "ابن مسعود" و "عبدالرحمن بن عوف" و دەیانی تر لە کیبار و گەورەی صەحابەن.

**چینی دووەم: باشترین چینی ئوممەت (تابعین).**

تابع زانایان کۆکن لەوەی کە ئەوانەن کە هاوڕێیەتی هاوەڵانیان کردووە، واتە (صحب أصحاب النبی) هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەرن. هەروەها هاوەڵانیان بینیووە و لەخزمەتیاندا بوونە، ئەمانیش پلەو پایەی هەندێکیان زۆر زیاترە لە هەندێکیان وەک، "إبن المسيب" و "عروه" و "سالم بن عبد الله" و "حسن البصری."

تەنانەت ئەم چینەش چەند چینێکن، بۆنمونە بەوانەی کەوا أبو بكر و عمریان بینیبێت پێیان دەڵێن (من كبار التابعين) و ئەوانەی کەوا هاوەڵانی تریان بینیبێت وەک، "انس" و "ابن عمر" و "ابن عباس" و هەندێک لە هاوەڵە تەمەن درێژەکان پێیان دەڵێن (من صغار التابعی)، هەروەک چۆن ئەم شتە لەنێو هاوەڵانیشدا مەوجودە.

**چینی سێیەم: باشترینی ئوممەت (تابعی تابعين).**

ئەم چینەش ئەوانە دەگرێتەوە کەوا چینی دووەمیان بینیووە، واتە (صحب صاحب أصحاب النبی) هاوڕێی هاوەڵی هاوەڵانی رسول اللەن. وەک "إمامی ئەوزاعی" و "إمام مالك" و "سفیان بن عیینە."

قال النووي رحمه اللّٰه:

الصَّحِيحُ أَنَّ قَرْنَهُ ﷺ : الصَّحَابَةُ، وَالثَّانِي: التَّابِعُونَ، وَالثَّالِثُ: تَابِعُوهُمْ.[١]

وقال الحافظ ابن حجر رحمه اللّٰه:

قَوْلُهُ (ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ) أَيِ الْقَرْنُ الَّذِي بَعْدَهُمْ، وَهُمُ التَّابِعُونَ، (ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ) وَهُمْ أَتْبَاعُ التَّابِعِينَ.[٢]

ئەم سێ چینە باشترینن بەقسەی رسول اللە ﷺ، بۆیە عەقیدە و تەوحیدتان لەوان وەر بگرن و تا پێتان دەکرێت کتێب و ژیاننامەکانیان بخوێننەوە و چاو لەوان بکەن چونکە (خیر القرون)ن.

١ انتهى من شرح النووي على مسلم... (١٦/٨٥).

٢ انتهى من فتح الباري... (٧/٦).

## بەشی دەیەم: پلەکانی هاوەڵان.

باسکردن و ناساندنی چینی هاوەڵان و پلەوپایەیان بەتایبەت لەبواری حەدیث گرنگە.

**پلەی هاوەڵان:** زاناکانی سەلەف دەیان کتێبیان لەسەر مەعریفە و چینەکانی هاوەڵان نوسیووە. هەریەکە و بەجۆرێک باسیکردووە و چینەکانی دیاریکردووە، بەڵام هەموویان موتەفیقن لەم پلەبەندیانە.

١- **چینی یەکەم:** ئەوانەی سەرەتا لەمەککە موسڵمان بوون، وەک لە پیاو "أبو بكر" و لەگەنج "على" الله لێیان ڕازی بێت و "خەدیجە"ی خێزانی و چەند دانەیکی تر کە لە پلە بەرزەکانن پێیان دەوترێت (سابقون الأولون).

٢- **چینی دووەم:** موهاجیرانی حەبەشەیی وەک "جعفر بن ابى طالب" و هاوەشێوەکانیان یەکێکن لەپلە بەرزەکان.

٣- چینی پەیمانی (عقبەی یەکەم) یەکێکن لە پلە بەرزەکانی هاوەڵانی ئیسلام.

٤- چینی موهاجیرانی بەرەو مدینە دوای دەعوە و بانگەوازی مەککە.

٥- ئەهلی بدری گەورە.

٦- ئەهلی (ئوحد) و ئەهلی بەیعەی رضوان.

بۆیە کاتێک زاناکانی تأریخ لە پێناسەی هاوەڵاندا دەڵێن، بۆنمونە "إبن مسعود" الله لێی ڕازی بێت، دەڵێن (من السابقین الأولین) و (أحد عشره المبشره) (بەدری) و چەندان پلەی بەرزی تر یان تەنیا (بەدری) یان دەڵێن ئەهلی بەیعەی رضوان، بۆ؟

چونکە ئەمانە الله لە دونیادا لە هەموویان ڕازی بووە و پلەو پایەیی ئێجگار گەورەیان هەیە. هەروەها لەبارەی ژمارەی هاوەڵان بۆچوونی جیاواز هەیە. هەندێک دەڵێن سەد هەزار و هەندێک دەڵێن سەدوو بیست هەزار.

لە هاوەڵە هەرە بەرزەکانی عیلمی حەدیث یان فەرمووده:

١- ئەبو هریرە رضی الله عنه.
٢- عبدالله بن عمر بن الخطاب رضی الله عنهما.
٣- عبدالله بن عباس رضی الله عنهما.
٤- أنس بن مالك الأنصاری رضی الله عنه.
٥- عائشة بنت أبی بکر و أم المؤمنین و زوج النبی ﷺ.
٦- جابر بن عبدالله الأنصاری رضی الله عنهما.
٧- أبو سعید الخدری رضی الله عنه.
٨- عبدالله بن عمرو بن العاص رضی الله عنه.

ئەمانە لە پێشی پێشەوەن لە فەرموودە نەک پلە. بۆیە چەندان هاوەڵی سابقین و (بەدری) و پلە بەرزەکان هەن کەوا بەدەگمەن نەبێت جگە لە ئەهلی نەناسراون، کەچی هاوەڵێکی وەک "أبو هريرە" لە (خيبر) موسڵمان بوو. بەدەگمەن نەبێت گەر نا هەموو کەس دەیناسێت.

## بەشی پانزەیەم: (محدث) و پلەکانی چین؟

لەم بەشەدا پێناسەی (محدث) و پلەکانیان و کێن و چین. زاناکان بۆ ئەم عیلمە و ئەوانەی خەریکین چەند پلەیەکیان داناوە بەمشێوەیە:

### ١. المحدث:

ئەو کەسەیە کەوا خەریکی عیلمی حەدیثە و شارەزایە بە (جرح و تعديل و سند) و هەزاران فەرموودەی لەبەرە بەسەند.

### ٢. الحافظ:

ئەم کەسەیە بەشێک لەزاناکان دەڵێن دەبێت سەد هەزار فەرموودەی بەسەنەد و مەتن لەبەر بێت و شارەزابێت بەعیلمی حەدیث و (جرح و تعديل) وەک حافظ "إبن حجر" یان "إبن كثير."

### ٣. الحاكم:

ئەو کەسەیە کەوا خەریکی عیلمی حەدیثە هەندێک لە زانایان دەڵێن دەبێت حەوت سەد هەزار و هەندێک دەڵێن سێ سەد هەزار فەرموودەی و راجع وایە یەکەم بێت لەبەربێت بەسەنەد و بە مەتن و شارەزای (جرح وتعدیل) بێت بە هەموو بەشەکانیەوە وەک حاکم "نیسابوری" و "أبو داود سجستانی."

## ٤. أمير المؤمنين:

ئەمە بەرزترین پلەی ئەم عیلمەیە و کۆتا پلەیە لەم عیلمە لەسەروو هەموویانەوەیە بەجۆرێک حافظی هەموو سەنەد و مەتنەکانە گەر پرسیاریان لێکرد لە فەرموودەیەک وتی نەم بیستووە واتە فەرموودە نییە. وەک ئەو تاقیکردنەوەی بۆ ئیمامی "بخاری"یان کرد کاتێک دەیان سەنەد و مەتنیان تێکەڵ کرد و لە مەجلیسێکی گەورەدا تاقییان کردەوە، لەسەرەتادا گوتی هیچم نەبیستووە، ئنجا هەر فەرموودە و سەنەد و مەتن و ڕاویەکی گەیاندەوە بەیەک. وەک ئیمامی "شعبە بن حجاج" و "سفیان الثوری" و "یحیی بن سعید القطان" و ئیمامی "أحمد" و ئیمامی "بخاری." ئەم عیلمە هێندە وردە لەنێو هەر بەشێکی چەندان عیلمی تری وردی لێ دەبێتەوە.

## بەشی دوانزەیەم: فوقەهای حەدیث لە هاوەڵان و سەرەتای نوسینی حەدیث و کۆتای هاتنی.

لەم بەشەدا دەمەوێت پوختەیەک لەچەند باسێکدا باسبکەم بەکورتی و دابەشی دەکەمە سێ خاڵ یان سێ بەش.

**یەکەم: فوقەها و پێشەوایانی حەدیث لە هاوەڵان لەژمارەی ڕیوایەتکردنی فەرموودەدا.**

بێگومان هاوەڵان ژمارەیان گەلێک زۆر بووە دەیان هەزار هاوەڵ بوونە، بەڵام لەنێویاندا هەندێکیان تایبەتن بەهۆی زۆری گێڕانەوەی فەرموودە لە رسول اللهوە ﷺ. زانایان بەمشێوەیە تەرتیبیان کردووە.

١. أبی هریره رضی الله عنه.

ئەم هاوەڵە لەبەرزترین پلەی ڕیوایەتکردن دایە. لەفەرموودەدا هیچ هاوەڵێکی تر هێندەی ئەم فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە زیاتر لە پێنج هەزار و سێ سەد فەرموودە. سەرەڕای ئەوەی تەنها چوار ساڵ هاوەڵێتی پێغەمبەری کردووە سبحان الله.

٢. عبدالله بن عمر بن الخطاب.

هاوەڵی بەڕێز إبن عمر لەدوای ئەبو هرێرە زۆرترین فەرموودەی ڕیوایەتکردووە کە یەکێک بووە لە هاوەڵە بچووکەکان بەشداری خەندەقی کردووە تەمەنی پانزە ساڵ بووە لە ئوحود بەهۆی بچووکییەوە ڕێگایان پێنەدا. ژمارەی ئەم فەرموودانەی کە گێڕاویەتەوە دەگاتە زیاتر لە دوو هەزار و شەش سەد فەرموودە.

٣. أنس بن مالك الأنصاری.

خادمی رسول الله دوای ابن عمر زۆرترین فەرموودەی گێڕاوتەوە کە دەگاتە دوو هەزار و دوو سەد و هەشتا و شەش فەرموودە.

٤. أم المؤمنين عائشة بنت أبی بكر رضی الله عنها.

بەشێک لە عیلمی ئەم ئوممەتە لای ئەم ئافرەتەیە. دایکمان عائشە زۆرینەی هاوەڵە گەورەکانی ئوممەت دەچوونە لای پرسیاریان لێدەکرد. ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە دوو هەزار و دوو سەد و دە فەرموودە.

٥. عبد الله بن عباس رضی الله عنهما.

موفەسیر و فوقەها و موحەدیثی ئوممەتە دوای دایکمان عائشە. زۆرترین فەرموودەی گێڕاوەتەوە دەگاتە هەزار و شەش سەد فەرموودە.

٦. جابر بن عبدالله الأنصاری رضی الله عنهما.

ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە هەزار و پێنج سەد فەرموودە.

٧. أبو سعيد الخدری رضی الله عنه.

زیاتر لە هەزار و سێ سەد فەرموودەی لەبەربووە.

٨. عبدالله بن مسعود رضی الله عنه.

هەشت سەد و هەشتا فەرموودەی لەبەربووە.

٩. عبدالله بن عمر بن العاص.

حەوت سەد فەرموودەی لەبەربووە.

**دووەم: سەرەتای دەرچوونی نوسینی (صحیح و مسندەکان).**

بێگومان دوای وەفاتی نبي، پێشتر باسمکرد هاوەڵان زۆر گرنگیان بەم باسە نەدا بەهۆی قورئانەوە، دوای قۆناغێک "عمر بن عبدالعزیز" داوای نوسینەوەی فەرموودەکانی رسول اللەی کرد، چونکە پێی وابوو گەرنا ئەم عیلمە ووندەبێت و نامێنێت. بۆ نمونە، لەچینی یەکەمی تابعی هیچ (مسند و مصنف)ێک نییە وەک، "سعید بن المسیب" یان "حسن البصری" یان "سالم بن عبدالله" یان "عروه بن الزبیر" هەتا دوای چەندان پێشەوای هەرە گەورەی تر، بەڵکو ئەوەی هەبووە هێزی حفظ و لەبەرکردنیان بووە. بەڵام دوای جیلی "ابن شهاب الزهری"، ئنجا دەستی پێکرد وەک (مسندی

نعيم بن حماد) دواتر يان (موطأ مالك بن أنس) إمام دار الهجره كه باسم كردووه. دواتر (مسند إمام أحمد) و (مسند اسحاق بن راهويه) و دواتر صحيح دەرچوو. يەكەم كتێبى (صحيح إمام بخارى)يە كە هەموو سەنەد و مەتنى ڕاستى تێدايە، هەرچەندە (موطأ) سەدەيەك وەك "بخارى" بوو، بەڵام هەموو مەرجەكانى تێدانەبوو.

دواتر (صحيح مسلم بن الحجاج)، ئنجا (سنن أبو داود) و (سنن ترمذى) و (إبن ماجه) و هاوشێوەكانيان. ئەمە گەورەترين سەدەى زێڕينى نوسين و دەرچوونى صەحيح و موسەنەدەكان بوو كە تا ئەمڕۆش بوونە حوجەى دين.

## بەشى سيانزەيەم: (معرفه أقسام الحديث) زانينى بەشەكانى (علوم الحديث).

دەمەوێت كورتەيەك لەسەر ئەم عيلمە باس بكەم كە چى كاتێك پەرەى سەنەد و كێ يەكەم كتێبى لەسەر نوسيووە. ئەم عيلمە تايبەتە بە بەشەكانى زانستى فەرموودە و (صحيح) و (ضعيف) و (حسن) و (مرفوع) و (موقوف) و (مقطوع) و (مرسل) و (معضل) و (منقطع) و (شاذ) و

(معلل) و (المضطرب) و (الموضوع) و (مشهور) و (عزيز) و (غريب) و الخ، دەيان جۆرە.

سەرەتای نوسينی ئەم عيلمە وەک "حافظ ابن حجر" لە (النزهە) دەڵێت يەكەم كەس كەوا كتێبی لەسەر ئەم عيلمە نوسی "قاضی أبو محمد الرامهرمزی" بوو بەناوی (المحدث الفاضل)، بەڵام زۆر بە ووردی نەيپێكابوو. دواتر "حاكم أبو عبدالله النيسابوری" كتێبی دانا لەسەری بەناوی (معرفة علوم الحديث)، دواتر "ابو نعيم الأصبهانی" ئينجا دواتر "حافظ خطيب البغدادی" كتێبێكی زۆر وورد و پووختی نوسی بەناوی (الكفاية)، هەروەها لە ئاداب و ئوسوڵی قوتابيش بەناوی (الجامع الآداب الشيخ والسامع) كە "ابو بكر الخطيب" نوسی.

ئنجا دوای ئەم قۆناغە "قاضی عياض" كتێبكی دانا بەناوی (الإلماع)، دواتر "حافظ ابن صلاح الشهرزوری" كتبێكی زۆر بەسوودی دانا لەسەر ناساندنی ئەم عيلمە كە زۆر كاريگەر بوو و تا ئەمڕۆش كە مەشهورە بە موقەديمە "ابن صلاح"، انتهی..

پاشان دواتر چەندان كتێبی تر دانران وەک (اختصار علوم الحديثی ابن كثير) كە ئەميش پوختەی موقەديمەی "ابن صلاح"بوو. هەروەها (نخبة الفكری ابن الحجر العسقلانی) كە دواتر شەرحی كرد بە ناونيشانی (نزهە النظر) و (تدريب الروی للسيوطی) و (فتح المغيث للسخاوی)..

ئەمە کورتەیەک بوو لە مێژووی ئەم عیلمە. لە حەدیث و ئەقسامەکان یان جۆرەکان زۆرن بەپێی (کتاب و مصنفات) هەیە چلی باسکردووە، هەیە پەنجا، هەیە شەست. بەمشێوەیە زیاد و کەم هەندێکیان پەیوەندیان بە مەتنی فەرموودە هەیە، واتە ناوەڕۆک و هەندێکیان پەیوەندیان بە سەنەدی فەرموودەوە هەیە، واتە حاڵی ڕاوی ڕیوایەتکاری فەرموودە پشتیوان بە الله کورتەیەک لە هەندێک لەم بەش و جۆرانە باس دەکەین بەکورتی و بەنمونەوە. دەروازەیەک بۆ ناوەڕۆکی باسەکە بەنمونە.

دوای باسکردنی مێژوو و دیوی دەرەوەی ئەم عیلمە ووردە، دەمەوێت بەکورتی کەمێک بچینە قوڵایی ئەم عیلمە. پێشوتر ئاماژەم پێداوە ئەم زانستە دابەشی دوو چین دەبێت کە پێی دەڵێن (درایە) و (روایە). کە دێینە سەر درایە (عیلمی درایە) لە زانستی فەرموودە، لەنێو خودی ئەم عیلمە چەندان عیلمی تری قوڵی لێدەبێتەوە. ئەم عیلمە لە چۆنیەتی تەعاملکردن لە سەنەد و مەتن و جۆرەکانی صحیح و ضعیف و هەروەها لە ڕاوی ڕیوایەتکاری فەرموودەش دەکۆڵێتەوە بۆنمونە:

## یەکەم جۆری حەدیث پێی دەڵێن (صحیح).

بێگومان صحیح چەندان شروطی تایبەتی هەیە کە دەبێت هەبێت لەم فەرموودەیەدا. بۆنمونە، لەم فەرموودە دەکۆڵینەوە بزانین چۆنە چۆن نییە.

حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: فُرِضَتِ الصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ هَاجَرَ النَّبِيُّ ﷺ، فَفُرِضَتْ أَرْبَعًا، وَتُرِكَتْ صَلَاةُ السَّفَرِ عَلَى الْأُولَى.

ئەم فەرموودە (صحيحە) لەزۆرینەی (سنن و مسند)ەكان هەیە و ئیمامی "بخاری" و ئیمامی "مسلم"یش ڕیوایاتیان كردووە.

**مەرجی یەكەمی فەرموودە لە (صحیح)** دەبێت سەنەد (متصل) بێت واتە كاتێک گوتوویەتی:

(حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ) ئەمە (متصل)ە، هیچ پچڕانێک ڕوووینەداوە، كەواتە مەرجی یەكەمی لێهاتووەتەدی. ئنجا دەبێت **مەرجی دووەمی** تێداهەبێت كە ئەمیش نابێت

١- (شاذ) بێت.
٢- (معلل) عیلەی هەبێت.

ئەم دوو مەرجە پەیوەندی بە سەنەد نییە، بەڵكو پەیوەندی بەناوەڕۆک، واتە مەتنەوە هەیە كە فەرزبوونی نوێژە نابێت شاز بێت، واتە ناوەڕۆک نابێت پێچەوانەی فەرموودەی تر بێت. بۆ نمونە، فەرموودەمان هەیە دەفەرمووێت: (نهى عن الصيام إذا أنتصف الشعبان) أحمد و أبی داود و ترمزی ڕیوایەتیان كردووە سەنەدی مقبولە، بەڵام

فەرموودەی ترمان هەیە دەفەرموویت: (لاتقدموا رمضان بصوم يوم أو يومين إلا رجل يصوم صوما فليصمه). بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە.

ئێستا لەفەرموودەی یەکەم جائیز نییە، بەڵام لە فەرموودەی دووەم لەنیوەی شەعبان جائیزە، کەواتە دووەم مقبولە یەکەم شازە. هەروەها نابێت عیلەی هەبێت. واتە مەتن و ناوەڕۆکی فەرمودەکە عیلەی قادحەی هەبێت، واتە بۆنمونە فەرموودەیەک نەفی شتێک بکات یەکێکی تر ئیثبات، چونکە ناوەڕۆک دەگۆڕێت.

**مەرجی چوارەم** دەبێت ڕاوی ئەم کەسانەی فەرموودەیان نەقڵ کردووە (عدل) و (ظابط)بن، واتە چۆن؟ بۆنمونە (حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ ، حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا مَعْمَرٌ ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ، عَنْ عُرْوَةَ ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا).

ئەمە سەنەدی فەرموودەیە کێ ڕاوین؟ "عروه بن الزبير" ئنجا "إبن شهاب الزهری" ئنجا "معمر" ئنجا "يزيد بن زريع" ئنجا "مسدد" ئنجا "بخاری".

واتە "بخاری" لە "مسدد"ەوە نەقڵی کردووە کە ثیقەیە و متمانەپێکراوە. "مسدد" لە "يزيد بن زريع"ەوە نەقڵی کردووە، ئەمیش دەبێت جێی متمانەبێت. ئنجا "ابن زريع" لە "معمر" . ئنجا "معمر" لە "ابن شهاب الزهری"ەوە وەریگرتووە کە عەدلن. واتە مستقیم بوونە لەسەر دین

نەگۆڕابن. نابێت فاسق بن چونکە فاسق خەبەری لێوەرناگیرێت. قال الله: (إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا)[١]

هەروەها دەبێت ڕاوی ناو سەند حافظی بەهێزبێت، نابێت نسیانی هەبێت واتە شتی لەبیرنەچێتەوە. وەک زانراوە لەسەرەتا نوسین نەبووە، بەڵکو هێزی لەبەرکردن کاتێک (طالب العلم) لە مەجلیسی عیلم بووە ئەم فەرموودانەی لە دەمی شێخ دەرچوون بە سەنەد و مەتن هەمووی حفظ کردووە. کەواتە کاتێک فەرموودەیەک بۆت دانراوە و نوسراوە (صحیح) ئەوا بەم هەموو تەدقیق و تەحقیقەدا هاتووە بەسەلامەتی، چونکە سەلەف زۆر ترساون لەم فەرموودە، (من كذب على متعمدا فليتبوأ مقعد من النار). یان (من حدث بحديث يرى أنه كذبا فهو أحد من الكاذبين). رسول الله دەفەرمووێت: (إن كذب عليّ ليس ككذب على أحد...).

ئنجا دوای (صحیح)، (حسن) دێت و زانایان ڕایان جیاوازە. هەندێک کردوویانە (حسن لذاته) و (حسن لغیر)، بەڵام باشترین ناساندن بۆ فەرموودەی (حسن) ئەوەیە کە سەرجەم مەرجەکانی (صحیح)ی تێدایە، بەڵام لە (ظبط) خفیفە، واتە هێزی لەبەرکردن و لەگەڵ کەمێک نسیان، واتە بیرچوونەوە. ئنجا دوای (حسن)، (ضعیف) دێت کەوا چەندان جۆر

---

١ سورة الحجرات: ٦

و شێوازی هەیە (ضعیف) پێچەوانەی (صحیح) و (حسن)ە، واتە ئەگەر مەرجەکانی (صحیح) و (حسن)ی تێدا مەوجود نەبوو لاواز دەبێت.

ئەمەی سەرەوە کورتەیەکە بوو بە نموونەی زیندوو لەسەر هەندێک لەجۆر و مەرجەکانی (صحیح) زیاتر بۆئەوەی بزانن ئەم عیلمـە چەندە ووردە، بۆیە خاڵ بەخاڵ ناچمە سەر جۆرەکان کە دەیان جۆر فەرموودەمان هەیە، چونکە ئەوەی پێویست بێت لەسەرتان ئەوەیە چۆن هەوڵی بەدەست هێنانی دەدەن.

بۆنمونە عیلمی (علل) یان (جرح و تعدیل) ئەم عیلمە خۆی لە خۆیدا بەحرێکە کە لە حاڵ و ناساندنی ڕاوی فەرموودەکان دەکۆڵێتەوە. زانایان زۆر گرنگیان پێداوە کاتێک ناوی "علی إبن المدینی" بێت طالب العلم دەزانێت واتە عالمی عیلمی (علل) چونکە ئیمامی ئەم عیلمە بوو یان "دار قطنی" و دەیان کتێب و مەجەلداتی زۆر گەورە دانراوە لەسەر ناساندن و زانینی حاڵی ڕاوی. بۆنمونە، (تهذیب الکمالی مزی) کە بیست و چوار موجەلەدە تایبەتە بەناساندن یان (تهذیب التهذیب). بەڵام ئێمە الحمدلله ئەم ئەرکەمان لەسەر سووککراوە ئەمیش بە شەونخونی و کۆڵنەدانی سەدان ساڵەی زانایان، واتە هەزار ساڵە بەردەوام تەحقیقات کراوە تا ئەمڕۆ کەوا وەک بڵێین ئێمە لەسەر سفرەی ئامادەیین، بەڵام هەر هەوڵی بۆ نادەین.

## بەشی چواردەیەم: ناساندنی چەند جۆرێکی تر لە جۆرەکانی حەدیث.

لەم بەشەدا چەند جۆرێک لە جۆرەکانی حەدیث دەناسێنن بەکورتی کە پێویستن ئەمانیش:

### ١. مرفوع.

واتە بەرزبوونەوە لەڕووی زمانەوانیدا (لغوی)، واتە زمانەوانی شتێک بەرزبێتەوە. ئنجا ئێمە لە مەعریفەی حەدیثین، بۆیە بەو فەرمودانە دەوترێت (مرفوع) کە لەسەنەد دەگاتە رسول الله ﷺ، وەک ئەم نمونەی خوارەوە.

حَدَّثَنَا يَسَرَةُ بْنُ صَفْوَانَ، حَدَّثَنَاإِبْرَاهِيمُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ، عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: مَا سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ أَبَوَيْهِ لِأَحَدٍ إِلَّا لِسَعْدِ بْنِ مَالِكٍ[١].

ئەم جۆرە سەنەدە پێی دەڵێن (مرفوع) ئەمە بەکورتی.

### ٢. موقوف.

---

١ صحيح بخاری

واته ڕاوەستان ڕاوەستا و لە (علوم الحديث) بەو جۆرە سەنەدانە دەوترێت ڕاوەستاو یان (موقوف) کە لە صەحابی ڕادەوەستێت، واتە سەنەدەکە لە "بخاری"یەوە تا دەگاتە "أبو هريره" یان "أنس یان ابن عمر"، وەک ئەم نمونەی خوارەوە:

وَقَالَ لِي خَلِيفَةُ : حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنْتُ فِيمَنْ تَغَشَّاهُ النُّعَاسُ يَوْمَ أُحُدٍ، حَتَّى سَقَطَ سَيْفِي مِنْ يَدِي مِرَارًا؛ يَسْقُطُ وَآخُذُهُ، وَيَسْقُطُ فَآخُذُهُ .

ئەمە (موقوفی) پێ دەڵێن لە "أبی طلحة" وەستاوە. بەڵام لەچەند حاڵەتێک (موقوف) حوکمی (مرفوع) وەردەگرێت یان ڕاستەوخۆ بەرز دەبێتەوە ئەمانیش لەو حاڵەتانەی کە هاوەڵێک قسە لەبارەی باسە غەیبییەکان وەک (فتن و ملاحم) و نیشانەکان بکات  ئەمە ڕاستەوخۆ حوکمی (مرفوعە)، واتە دەدرێتە پاڵ پێغەمبەر، بۆ؟ چونکە مسائیلی غەیبە، صەحابە چۆن غەیبیان زانیووە، گەر رسول الله پێی نەگوتبن و حاڵەتێکی تر و مەسائیلانەی کە مەجالی ئیجتهادی لە دین تێدانییە. بۆنمونە، هاوەڵەڵێک (قول)ێک (فعل)ێک بکات. لەدیندا کە مەجالی (اجتهادی) تێدا نەبێت حوکمی مەرفوعە چونکە هاوەڵە بەڕێزەکانی ئوممەت کە (خير القرون) بوون، چون شتێک دەکەن زیاد بێت یان کەم بێت لەدیندا، والله أعلم.

## (مقطوع) پچڕان، پچڕاو:

ئەمەشیان لە (علوم الحدیث) بەم سەنەدانە دەوترێت کەوا لە تابعین ڕاوەستێت نەگات بەهاوەڵان وەک لە "حسن البصری"، یان "سعید بن المسیب" یان "عروه بن زبیر" یان "سالم بن عبدالله" بەمشێوەیە ئەمە جیاوازە لەگەڵ (منقطع)، چونکە (منقطع) پچڕان لەسەنەدە، بەڵام ئەمەیان نەخێر وەک ئەم نمونە، صحیح مسلم. مقدمة:

حَدَّثَنَا حَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، وَهِشَامٍ، عَنْ مُحَمَّدٍ، وَحَدَّثَنَا، عَنْ هِشَامٍ قَالَ: وَحَدَّثَنَا مَخْلَدُ بْنُ حُسَيْنٍ، عَنْ هِشَامٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: إِنَّ هَذَا الْعِلْمَ دِينٌ، فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ.

## (منقطع) پچڕان لەسەنەد:

ئەم پچڕانەش دەکرێت لەسەرەتا بێت یان لەناوەڕاست یان لەکۆتایی بێت و زانایان دابەشی چەند جۆریان کردووە. ئەگەر پچڕانی سەنەد لەسەرەتاوە بوو ئەوا پێی دەڵێن (معلق). ئەگەر پچڕان لەکۆتایی سەنەدی ڕاوی ڕیوایەت کاری فەرموودە بێت پێی دەوترێت (المرسل).

ئەگەر بێتو پچڕان لە سەنەد بە دوو پیاو یان ڕاوی بێت پێی دەوتریت (المعضل) لە تەعریفی (المعضل) کە بەشێکە لە (منقطع) کە پچڕانی دوو

ڕاوی لەسەنەد بەدوای یەک نەک بەجیاواز. ئەمانە لە جۆرەکانی فەرموودەی لاوازن و لاوازترینیان (المعضل)، چونکە دوو ڕاوی لێپچڕاوە.

ئەوەی گرنگ بێت تیشک بخەنەسەری دوای (صحیح) و (حسن) و (ضعیف) دێت و فەرموودەی لاواز دەیان جۆری هەیە و (ضعیف جدا) هەیە و فەرموودەی (الموضوع) واتە هەڵبەستراو (منکر). بەڵام ئێمە الحمد لله بە فەضلی الله لەم کێشە و لەم ماندووبوونە ڕزگارمان بووە ئێمە لەسەر سفرەی حازرین، واتە پێویست ناکات جگە لە کەسی عالم یان موحەددث بێت ئەم شتانە بەووردی هەموو بزانێت دیاریکراوە کام فەرموودە لاوازە کامیان (صحیح)ە کامیان (حسن). تەنانەت پێمان ووتراوە جۆری ضعفەکەی چییە و چۆنە و بۆچییە ولله الحمد والمنە.

## بەشی پانزەیەم: دوو بابەتی گرنگ لە عیلمی فەرموودە.

لەم بەشەدا دوو عیلم یان دوو باسی زۆر گرنگ باس دەکەین بەکورتی کە زۆر گرنگن.

١. زانستی (ناسخ و منسوخ) لە حەدیث.
٢. (إسناد) یان سەنەدی فەرموودە.

### ١. زانستی (ناسخ و منسوخ) له حەدیث.

(ناسخ الحدیث) منسوخه، چۆن له علومی قورئان ئەم عیلمه گرنگ بوو بەهەمان شێوه له حەدیث ئاوا گرنگه چونگه سەدان فەرموودەمان هەیه کەوا نەسخ بووەتەوه حوکمیان، بۆ ؟ چونگه بۆ کاتێکی دیاریکراو بوو زانایان له سەلەف و خەلەف زۆر گرنگیان پێداوه.

چەندان فەرموودەی نێو (صحیحین) واته "بخاری" و "مسلم" هەن کەوا نەسخ بووەتەوه، بۆنمونه لەبوارەکانی (طهاره و صلاة و غسل المیت و وەمسائیله فقهیەکانی تردا) لەسەرەتای ئیسلام جۆرێک بوون، دواتر لەنێوەڕاست جۆرێکی تر، واتا لەکۆتایی هەموو شتێک ثابت بوون وەک الله دەفەرمووێت (الیوم أکملت لکم دینکم)

بۆنمونه لەسەرەتا له نوێژدا گەر سەلام بکرایه یان کاری پێویست وەڵامی دەدرایەوه. دواتر جێگیربوو بەهیچ شێوەیەک وەڵام و قسه لەنوێژدا ناکرێت. یان لەبارەی بەڕۆژووبوونی (عاشورا) فەرزبوو، دواتر "عائیشەی" دایکمان الله لێی ڕازی بێت دەڵێت: دوای فەرزبوونی ڕۆژوو

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووین کێ دەیەوێت پێ بێت و ئەوەی پێش نەبێت ئاساییه واته موخەیرکران. یان (غسل)ی ژن و مێرد تا ئەم کاته

بوو کە ئاو ببینرایە، بەڵام "ئەبو هرێرە" دەڵێت پێمانی فەرموو (فإن جهدها بين شعبها الأربع فقد وجب الغسل).

لەسەرەتای ئیسلام مەسائیلەکان جۆرێک و دواتر جۆرێکی تر بوون و ئەم عیلمەش هەمووی بەستراوەتەوە بە (حفظ)، واتە هێزی لەبەرکردن چونکە سەدان فەرموودەن دەبێت هەموویان لەبەربکرێت و ئەگەر یەک ئەم عیلمەی نەزانێت فتوای لێوەرناگیرێت بەقەولی هاوەڵانی وەک (أمام علی و ابن عباس الله) لێیان ڕازی بێت.

### ٢. (إسناد) یان سەنەدی فەرموودە.

سەنەدی فەرموودە خۆی لەو کەسانە دەبینێتەوە کەوا فەرموودەیان نەقڵ کردووە. سبحان الله دەیان مەرجی زۆر قورس دانراون بۆ قبووڵکردنی فەرموودە، بەڵام سەنەد لەسەرەتا وەک "محمد بن سيرين" دەڵێت لە (مقدمه صحيح مسلم):

عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ : لَمْ يكُونُوا يَسْأَلُونَ عَنِ الْإِسْنَادِ، فَلَمَّا وَقَعَتِ الْفِتْنَةُ، قَالُوا : سَمُّوا لَنَا رِجَالَكُمْ، فَيُنْظَرُ إِلَى أَهْلِ السُّنَّةِ فَيُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ، وَيُنْظَرُ إِلَى أَهْلِ الْبِدَعِ فَلَا يُؤْخَذُ حَدِيثُهُمْ.

واتە لەسەرەتا پرسیار دەربارەی سەنەد نەدەکرا، بەڵام کاتێک فیتنە ڕوویدا ئنجا پرسیارکراو ناوەکەیان دیارکراوە. سەیر دەکرا گەر لەسەر

سونە بوایە لێی وەردەگیرا گەرنا لە ئەهلی بیدع بوایە ڕەفز دەکراو قبووڵ نەدەکرا.

هەروەها "دبسان" لە (مقدمه صحيح مسلم):

عَنْ مِسْعَرٍ ، قَالَ : سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ إِبْرَاهِيمَ يَقُولُ : لَا يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا الثِّقَاتُ.

"إبراهيم"یش دەڵێت واتە فەرموودە قبووڵ ناکرێت لە رسول الله ﷺ تەنیا دەبێت جێگای متمانە و باوەڕپێکراوبێت بۆ ئەمەش دەیان مەرجیان داناوە.

هەروەها عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ : إِنَّ هَذَا الْعِلْمَ دِينٌ، فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ.

واتە ئەم عیلمە مەبەست فەرموودەیە کە دینە بۆیە دەڵێت بزانن لەکێی وەردەگرن.

دواتر وورده وورده پەرەی سەند ئنجا علمی (علل) و (جرح و تعدیل) گەشەی سەند کە تایبەتە بەناسینی (رجالی حدیث) کە ئەمەشیان عیلمێکی تایبەت و سەربەخۆ و وورده. ئنجا زۆر گرنگە لە عیلمی حەدیثدا کاتی خۆی سەلەف بەماوەی چەنها مانگ و بەماندووبوونی زۆر دەگەڕان

تا له (اسنادی) فەرمووده دڵنیابن، بەڵام ئێمه الحمد لله ئەم ماندووبوونەمان لەسەر نەماوه تەنیا لەبەرکردنی ناوەکان نەبێت ولله الحمد.

# بەندی دووەم: سەرچاوەکانی حەدیث و باسکردنی کتێب و ژیانی بەشێک لە پێشەوایان.

## پێشەکی:

مەصدەر یان سەرچاوەکانی سونە واتە فەرموودە لای ئێمە واتە موسڵمان دوو جۆری باوەڕ پێکراوە، یەکەمیان پێی دەڵێن (کتب الستە)یە، دووەمیان (کتب التسعە)یە.

١. **( کتب الستە)**

بریتین لەمانەی خوارەوە:

- صحیح بخاری
- صحیح مسلم
- سنن أبی داود
- سنن ترمزی
- سنن إبن ماجە
- سنن النسائی

٢. **(کتب التسعە)**

بريتين لەمانەی خوارەوە:

- 🕮 صحيح بخارى
- 🕮 صحيح مسلم
- 🕮 سنن أبى داود
- 🕮 سنن ترمزى
- 🕮 سنن إبن ماجه
- 🕮 سنن النسائى
- 🕮 سنن الدارمى
- 🕮 موطأ إمام مالك
- 🕮 مسند إمام أحمد بن حنبل

ئەمانە سەرچاوەی باوەڕپێکراو سەرەتا و سەرەکین لای ئەهلی السنە ئەمەش واتای ئەوە نییە (صحيح و سنن و مسندەکانی تر) فەرامۆش بکرێن، وەک (صحيح ابن حبان) و (صحيح ابن خزيمە) و (مسند ابى داود الطيالسى) و (أبو يعلى) و (مصنف عبدالرزاق) و (إبن أبى شيبة) و (معجم الطبرانى صغير) و (اوسط و كبير) و (مستدرك حاكم) و (مستدرك على الصحيحين) و (سنن الكبرى والضغرى بيهقى) و (شعب الإمان). بەڵام ئەمانە فەرموودەی لاوازی زۆر زیاتر تێدایە.

کتێبی (التسعه بخاری و مسلم) زیاتر لە پانزە هەزار فەرموودە دەبێت بە تکرارەوە. (سنن أبی داود و ترمزی و ابن ماجە و دارمی و موطأ) بیست هەزارێک دەبێت بە تکرارەوە. (مسند أحمد) نزیکەی چل هەزار فەرموودە دەبێت، دە هەزاری دووبارەیە. هەموویان کۆبکەینەوە زیاتر لە هەشتا هەزار دەردەچێت، بە دووبارەوە لە هەموو بوارەکان مسائیلی عقیدە و ئیمان و طهارە و فقهو سەرجەم باسەکانی تری دین لەخۆ دەگرێت. بۆیە دوای چەندان تەحقیق و تەدقیق ئنجا کراوەتە سەرچاوە خۆ وەنەبێت خەڵک زۆر هەبن حافظی (کتب التسعة) بێت. زۆر بەدەگمەن نەبێت نییە چونکە گەر سەد هەزار زیاتر بەسەنەد و مەتنی لەبەر بێت دەگاتە پلەی (حفظ) کە (حفاظ) بڕوا ناکەم هەبێت ئەمڕۆ، والله أعلم.

ئنجا من دەمەوێت ئەم ڕێگا هەڵبژێردراوانەتان بۆ دیاری بکەم. هەروەها باسیان بکەم بەپوختی و کورتی.

# کتێبە بەناوبانگ و ناسراوەکانی فەرموودە.

## یەکەم: صحيح البخاري.

سەرچاوەی یەکەم و ڕاسترین و باوەڕپێکراوترین کتێب لە دیندا دوای قورئان بەتێکڕای زۆرینەی زۆری زانایانی سەلەف کتێبی (صحيح بخاری)یە کە پێویستە گرنگی پێ بدرێت و بێگومان گرنگی زۆریشی پێدراوە لە سەلەف تا خەلەف و تا ئەمڕۆش.

ئەمەش کەمێک لە ژیانی "بخاری" و (صحيح)ەکەی و هەندێک تایبەتمەندی تر.

**"أمير المؤمنين" و (صحيح)ەکەی بناسە.**

یەکێک لە ڕێبوارە هەرە چاک و ماندووەکانی ئەم ڕێیە کە زۆرینەی زۆری دەیناسێت و کەمێک لەمێژووەکەی دەزانێت ئەویش إمام "أبی عبدالله" محمدی کوڕی ئیسماعیلی بوخارایە مەشهورە بە (إمام بخاری). ساڵی ١٩٤ هیجری لەدایک بووە. ئەم سەدە سەدەی زێڕینییە و ساڵی ٢٥٦ هیجری وەفاتی کردووە. ئەم ئیمامە بەڕێزە قوتابی "إمام أحمد" و "اسحاق بن راهویە" و چەندان پێشەوای تر بووە.

وەك خۆی دەڵێت: "لە مەجلیسی شێخ اسحاق دانیشبووە گوتوویەتی گەر یەکێک هەبوایە سەرجەم فەرموودە صحیحەکانی رسول اللەی ﷺ کۆکردبایەوە". هەروەها دەڵێت: "لە خەودا رسول اللەی ﷺ بینیووە بە گەسک پێشی پاککردووەتەوە".

پێشەوای ئوممەت زۆر ماندوو بووە لە کۆکردنەوەی عیلم و چەندان قوتابی ناودار لەسەردەستی پێڕاگەیشتن، لەوانە "إمامی مسلم بن حجاج" خاوەنی (صحیح) و (ترمزی سنن). عالم و عابد و زاهد و متقی بووە زانایانی سەلەف و خەلەف ڕێزی زۆریان لێناوە و بەپێشەوای خۆیان داناوە.

هەروەها نازناوی(أمير المؤمنين)ی لە حەدیث پێدراوە. ئەمەش بەرزترین پلەی ئەم عیلمەیە کە لە تاریخی ئیسلام و فەرموودە چەند کەسێکی کەم گەیشتوون بەم پلەیە. ئەم پلەیە بۆ کەسێکە لە لوتکەی حفظ دابێت و عالم بێت بە (جرح و تعدیل و سند و متن) و هەموو شتێک لەسەر فەرموودە.

وەک زۆرینەی پێشەوایانی تر چەدان شار و وڵات گەڕاون. بۆ فێربوونی عیلم چووە بۆ مەدینە و شام و مەککە و کوفە و بەسرە و میسر چەندان شوێنی تر. تەرکیز بخەنە سەر ئەم کارەی زانایان ئەوان دوور

له ڕووی پڕ عیزەتیان سواڵیان بۆ فێربوونی عیلم کردووە، کەچی ئێمە عیلم لەپێشمانە بەدوای جەهل و نەزانییەوە وێڵین!!

**صحیح بخاری:**

که ناوی (الجامع المسند الصحیح المختصر من أمور رسول الله ﷺ وسننه وأیامه) بووه. ئیمامی "نووی" دەڵێت زانایان کۆکن کە ڕاسترین کتێب دوای قورئان ئەم کتێبەیە. زانایانی سەلەف و خەلەف و مەشریق و مەغریب زۆرینەی زۆریان موتەفیقن لەسەر ئەوەی ڕاسترین و پاکترین کتێب دوای قورئان (صحیح بخاری)یە.

ئیمامی "بخاری" هەندێک دەڵێن لە شەش سەد و هەندێک دەڵێن لە حەوت سەد هەزار فەرموودە ئەم کتێبەی داناوە. وەک خۆی دەڵێت وازم لەچەندەها فەرموودەی صەحیح هێناوە واتە لە ڕاست ڕاستری داناوە. ماوەی دانانی ئەم کتێبە (شانزە) ساڵی خایاندووە. سبحان الله تەمەنێکە. ئەم کتێبە پڕ نرخە بۆتە تیری سەر دڵی دوژمنانی دین، سەدان ساڵە تا ئێستاش دژە ئیسلام و دین فرۆشەکان بەدوای (نقد) واتە ڕەخنە و سووککردنی ئەم کتێبەوەن بەڵام نەیانتوانیوە.

یەکێک لە خۆشیەکانی ئەم کتێبە کاتێک دەگەیت بە فەرموودەیەک زۆر بە جوهد و بە حەزەوە دەیخوێنی و لەبەری دەکەیت چونکە گومانت لە

ڕاست و تەواوەتی نییە. چەدان شەرحیشی بۆ کراوە، چاکترین و باشترینیان (فتح الباری) کە حافظ شێخ "ابن حجر العسقلانی" نوسیوویەتی.

بەپۆستێک نە وەسفی ئیمام بوخاری دەکرێت نە صەحیحەکەی، بەڵام تەنها بۆزانین تابزانرێت سوارچاکانی حدیث کێ بوون و چیان کردووە و چۆن ئەم عیلمەیان هێناوە.

## دوو تایبەتمەندی گرینگ لە (صحیح بخاري).

### تایبەتمەندی یەکەم:

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی (صحیح البخاری) کە لەزۆرینەی صەحیح و سونەنەکاندا نییە ئەوەیە کاتێک لەبابێک دەچیتە ژوورە لە دەیان کتێب و بابی ترەوە دێیتە دەرەوە، واتە دەرگات لێداناخرێت، بەڵکو ئیمامی بەڕێز (أمیر المؤمنین) وایکردووە لەهەر بابێک کە لە دەرگاتدا و چوویتە ژوورەوە دەیان دەرگایی تری بۆ کردوویتەوە. بەڵام ئەم تایبەتمەندییە لە (صحیح مسلم)دا نییە، کاتێک لە بابێک دەچیتە ژوورەوە بەدەگمەن نەبێت ناتوانیت بێیتە دەرەوە واتە دەرگات لێدادەخرێت.

### تایبەتمەندی دووەم:

لەڕێگای عیلمەوە تێدەگەیت یەکێک لە تایبەتمەندییە هەرە نایابەکانی کتێبی ئاڵتونی "أبی عبدالله" (صحیح بخاری) ئەوەیە لە سەرەتای هەر بابێک پێش داخڵبوونی تەفسیری کردووە، واتە پێش چوونەژوورەوەت پێت دەڵێت چی هەیە واتە "أبی عبدالله" هاتووە لەسەرەتای زۆرینەی زۆری بابەکان دەیان فەرموودە و آثر و أقوالی هاوەڵان و تابعین دوای ئەوانیشی هێناوە بەجۆرێک لە صەحیحدا وجودیان نییە، ئەمەش واتای ژمارەی فەرموودەکان زۆر زیاتر دەکات لە ژمارەیی نێو خودی صەحیح. هەر ئەمەش وای کردووە حافظ شیخ "إبن حجر العسقلانی" ئەرکی قورستر بێت لەشەرح. کە وتم لە "بخاری"دا هاتووە بەچاو سەیربکەن و بەدڵ وەریبگرن.

## دووەم: صحیح مسلم

سەرچاوەی دووەمی باوەڕپێکراو لای زۆرینەی زۆری زانایانی سەلەف و خەلەف کتێبی (صحیح مسلم) کە ئەمەش کورتەیەک لە ژیانی ئیمام موسلیم و صەحیحەکەیەتی.

**إمام "المسلم" و (صحیح)ەکەی.**

یەکێک لەو ناوانەی زۆرینەی وەک ناوی خۆیان دەیزانن و دەیناسن إمام المسلم "أبی الحسن مسلم بن حجاج القشیری النیسابووری" لە ساڵی ٢٠٦ی هیجری لەدایکبووە یەکێکە لەپێشەوا گەورەکانی ئوممەتی ئیسلام لە حەدیثدا. لەتەمەنی مناڵیدا چووەتە بەر عیلم وەک کتێبەکان ئاماژەی پێ دەکەن. لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا تێکەڵی مەجلیسی عیلم دەبێت. لە سەرەتا لە وڵاتی خۆی گوێ لە دروس و وانە شەرعییەکان دەگرێت، دواتر باوکی بەسەفەر دەیبات بۆ مەککە لەوێ ئاشنای زانایان زیاتر دەبێت. ئەوەی گرنگە لە مێژووی پێشەوایانی سەلەف چەندان ووڵاتیان کردووە لەپێناو بەدەستهێنانی عیلم ئیمامی موسلیمیش وەک باقی پێشەوایانی تر چووە بۆ مەککە و عێراق و میسر و شام و چەندان وڵاتی تر.

شێخ المحدثین عیلمی لە زۆرێک لەپێشەوا گەورەکانی ئوممەت وەرگرتووە چونکە ئەمیش لەسەدەی زێڕین بووە، بۆیە لە شێخەکانی "أبی زرعە" و "إمام أحمد" و "إسحاق بن راهویە" و چەندان پێشەوای تری ئوممەت و یەکێک بووە لە هۆگرانی أمیر المؤمنین شیخ المحدثین "أبی عبدالله بخاری"بووە، بەجۆرێک کاتێک إمام دەچێتەوە وڵات بەردەوام هۆگرییەتی و لای ئەوە. تەنانەت کاتێک شێخ الأمە "بخاری" لەگەڵ یەکێک لە شێخە گەورەکانی ئەم کات "محمد بن یحیی" دەبێتە ناکۆکی، "محمد

بن یحیی" بوخاری مەنع دەکات تاوای لێدێت زۆرینەی زۆری هیجری بوخاری دەکەن. تەنانەت بەم هۆکارە لەنیسابوو دەردەکرێت تەنیا ئیمام موسلیم هیجری ناکات و هاتووچۆی دەکات. بۆیە "بن یحیی" لە موسلیمیش تورە دەبێت یان دەبێت واز لە بوخاری بێنێت یان نابێت لەمەجلیس ئەودا بێت. بۆیە شێخ الحدیث و عالم الأمة مەجلیس جێدێلێت و ئامادە نییە واز لە بوخاری بێنێت، بۆیە الله گەورەترین فەضلی لەگەڵیان کرد، ئەو کات خەڵک وازی لەم دوو ئیمامە هێنا. هەزار و دووسەد ساڵە هەموو جیهانی ئیسلامی ڕوویان تێکردووە شێخ المحدثین لە تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵی وەفات دەکات رحمە الله تعالی رحمە واسعە.

## (صحیح مسلم) یان (مسند الصحیح).

إمام موسلیم دوای خۆی گەوهەرێکی بۆ بەجێهێشتین تا مردن قەرزاری دەبین ئەمیش کە لای زۆرینەی زانایان بە (صحیح مسلم) ناسراوە. ئیمامی موسلیم دوای ماندووبوونێکی زۆر کە ماوەی دانانی پانزەساڵ بوو تا ئەم کتابەی دانا هەموو بوارەکان لەخۆ دەگرێت موقەدیمەکەی پارچە ئاڵتونێکە. هەر وەک خۆی ئیمام موسلیم دەڵێت: "لەنێوان سێ سەد هەزار فەرموودە ئەم کتێبەم داناوە و هەوڵمداوە ئەوەی (صحیح)بێت تیادا دابنێم. کتێبی زانایان لە سەلەف و خەلەف

موتەفیقن سەرەڕای هەندێک نەقد و ڕەخنە لێرەو لەوێ بەڵام دەڵێن سێیەم ڕاسترین کتێبە دوای قورئان و (صحیح بخاری). صەحیحەکەی لە پەنجاو چوار کتێب پێک دێت، ئەوەی گرنگە ئیمام موسلیم لە هێنانی فەرموودەیەک هاتووە چەند ڕیوایەت بەچەند سەند و لە چەند هاوەڵێک لە یەک باب باسکردووە و زۆرترین سودی لە شێخ المحدثین "بخاری" وەرگرتووە فەرموودەکان بە دووبارەوە ناگاتە هەشت هەزار فەرموودە.

هۆکاری ئەوەی موسلیم دوای بوخاری دێت ئیمام موسلیم لە هەندێک مەسائیلی (جرح و تعدیل)دا موتەساهیل ترە واتە ئاسانکار ترە، بەڵکو ئیمام بوخاری توندتر و موتەشەدید ترە. چەندان شەرحیاتیان بۆکراوە و باشترینیان شەرحی "نوویە" بەناوی (منهاج). ئەمە یەکێکە لە کتێبە هەرە گرنگەکان چەندەها تەحقیقی بۆکراوە، بۆیە بێخەم بن لە حفظ کردن لێی گەرچی هەندێک نەقد و لاوازکردنیان بۆکردووە بەڵام دووەم ڕاسترینە.

## سێیەم: سنن أبي داود

یەکێکی تر لە سەرچاوە گرنگەکانی سونەت یان حەدیث "سنن ابی داوود"ە کە زانایان لە سەلەف و خەلەف پشتگیریان کردووە و بەیەکێک

له سەرچاوەکانی هەم (کتب الستە) و هەمیش (کتب التسعە) دادەنرێت، بۆیە پێویستە گرنگی پێ بدرێت.

**ئەمەش کورتەیەک لە ژیانی "ابی داود" و (سنن)ەکەیەتی. (محدثان) بناسن ئیمام "أبی داود سجستانی".**

سبحان الله کاتێک ژیانی ئەم پێشەوایانە دەخوێنی و سەیری حاڵی خۆت دەکەیت تەنیا ئارەقەی شەرمەزاری داتدەگرێت. یەکێک لە زانا و پێشەوایانی حەدیث (صاحب السنن مشهورە سنن أبی داود). ئەم ئیمامە بەڕێزە "أبو داود سلیمان گوڕی ئەشعث سجستانی"یە. ساڵی ٢٠٢ کۆچی لەدایکبووە و ساڵی ٢٧٥ هیجری کۆچی دوایی کردووە. ئەم ئیمامە بەڕێزە قوتابی پێشەوای حەنبەلییەکان "إمام أحمد بن حنبل"بووە و کاریگەری ئەوی لەسەربووە و بەر لە وەفاتی "إمام أحمد" (سنن)ی پێ نیشانداوە.

ئیمامی ئەبو داود دەڵێت: " لە (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار فەرموودە ئەم سوننەی داناوە کە دەگاتە پێنج هەزار و نزیکەی سێسەد فـەرموودە. دەڵێت لەم پێنج هەزارەی کۆمکردووەتەوە چوار فەرموودە بۆ مرۆڤ کافیە یەکێک لەوانە:

(إنما الأعمال بالنيات والثاني قوله ﷺ من حسن إسلام المرء تركه ما لا يعنيه والثالث قوله ﷺ لا يكون المؤمن مؤمنا حتى لا يرضى لأخيه إلا ما يرضى لنفسه والرابع قوله ﷺ الحلال بين والحرام بين)."

ئەمەش گرنگی کتێبی ئەربەعون نەوەویمان بۆ دەرەخات کە بەشێک پێش ئێستا باسم کرد.

سبحان الله پێنج سەد هەزار فەرموودە، لە شوێنێک دەڵێت: "لەیەک ڕۆژدا چل فەرموودەی لەبەرکردووە". ئەمانە جیلێک بوون الله مێشکی تایبەتی پێ بەخشیبوون.

هەروەها (سنن أبی داوود) بە یەکێک لەحوججەکانی دین لە دوای بوخاری و موسلیم دێت و لە (کتب التسع) و (کتب ستە) ئەژمارکراوە. قوتابیشی گەلێک زۆربووە لەوانە "ترمزی" و "نسائی" خاوەنی (سنن)ەکان.

ئەوەی دەمەوێت سەرنجتان ڕابکێشم ئەم پێشەوایانە زۆر ماندووبوون لە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی سەروەرمان چەندان وولاتیان کردووە، وەک عێراق و شام و میسر و بلاد الحرمین. ئەمەش کورتەیەک لە ژیانی یەکێک لە ئیمامەکانی حەدیث ڕەحمەتی الله برژێت بەسەریان.

**ڕوونکردنەوە:** ئەوەی من دەمەوێت ئەمجارە بەشێوەیەکی زۆر جیاواز باس لە زانستی فەرموودە بکەم لەسەرەتا زانا و پێشەوایانی ئەم ڕێگایەتان پێ دەناسێنم بۆئەوەی بزانن ئەم فەرموودەیەی لە پێشتە چەندە بە زەحمەت و ماندوبوون هاتووەتە بەردەستت.

## چوارەم: موطأ إمام مالك

یەکێک لەسەر چاوەکانی تری سونەت یان فەرموودە موعتەمید لای زانایان کتێبی "موطأی إمام مالك"ە کە سەرچاوەیەکە لە (کتب التسعه)، نەک (کتب السته) واتە دوای بخاری و مسلم و ابی داوود و ترمزی و نسانی و ابن ماجه دێت، ئەمە کورتەیەک لەناساندنیانە.

(الموطأ) سودێک لە باسی (علوم الحديث لطالب العلم) یەکێک لە کتێبە بەنرخەکانی بواری حەدیث بریتییە لە کتێبی (الموطأ) کەوا پێشەوا "أبی عبدالله مالك بن أنس" نوسیوویەتی کە یەکێکە لە چوار پێشەوای (مەزاهیبی أربع) لە سالی ٩٣ هیجری بۆ ١٧٩ ژیاوە. ناسراوە بە ئیمامی (دار الهجره) واتە مەدینە.

یەکەم زانا بووە هەوڵیداوە زۆرترین فەرموودەی (صحيح) نەقڵ بکات بەجۆرێک ماندووبوونێکی زۆری چەشت لەپێناو عیلم و لەپێناو دین. ئەم

کتێبە تا هاتنی (صحیح بخاری) یەکێک بوو لە ڕاسترین کتێبەکانی بواری (علوم الحدیث)دا بەجۆرێک لە مەجلیسە عیلمییەکانی خوێندن و دیراسەت زۆر پشتی پێ بەستراوبوو، واتە وەک سەرچاوەی دەرسە شەرعییەکانی قوتابی شەرعی دەخوێنرا و ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبەکانی (کتب التسعەی ئەهلی سنە) و لە ئێستاشدا پشت پێ بەستراوە. ژمارەی فەرموودەکانی کە هاتوون لە موطأ ناگاتە سێ هەزار فەرموودە.

إمامی شافعی دەڵێت: "هیچ دوای کتابی الله کە قورئانە هێندەی کتابی (موطأ مالك بن انس) بەسوود نییە".

ئەم قەولەی پێش دەرچوونی (صحیح بخاری) بووە چونکە ئیمامی شافعی قوتابی "إمام مالك"بووە و چەند ساڵێک نێوانیان هەبووە.

هەروەها إمام بخاری دەڵێت: "ڕاسترین سەنەد لە مالك ئنجا "نافع" ئنجا "إبن عمر" و لەنێو (موطأ)دا سەنەدێکی زۆر بەمشێوەیە هاتوون، واتە (صحیحی إسنادی) زۆر تێدایە.

ئەم کتێب و زانایانە بە نوسینێکی ئاوا بچووک وەسف ناکرێن، بەڵام لەبەر ڕێز و ماندووبوون و خزمەتیان بۆ دین پێویست دەکات بناسرێت و بزانرێت و ئەمانە زیاتر طالب العلم سوودی لێ دەبینێت و نرخی دەزانێت.

# كورتەیەکی پووخت لە ژیانی فوقەها و پێشەوایانی حەدیث لەنێو هاوەڵاندا.

کورتەیەک لە ژیانی (فقهای حدیثی ئوممەت).

## أبی هریرە (رضی اللە عنە)

هاوەڵی بەڕێز أبي هريرة رضي اللّٰه عنه، ئەوەی من دەمەوێت سەرنجتان ڕابکێشم بۆی ئەوەیە هاوەڵی بەڕێز أبو هرێرە لە ساتی فەتحی (خیبر) هاتن خۆی و دایکی و غولامێک خۆی و غلام لە سەرەتا موسڵمان بوون. ئنجا دوای ئەوەی داوای لە رسول اللە ﷺ کرد دوعای هیدایەت بۆ دایکی بکات، ئنجا موسڵمان بوو. واتە ماوەی نێوان موسڵمان بوونی و وەفاتی پێغەمبەر ﷺ تەنیا چوارساڵیان بەین بوو، بەڵام بەقەد چواردە ساڵ وابوو کە لە خزمەتی دابێت. هاوەڵی بەڕێزی وا هەبووە بیست ساڵ لەخزمەتی دابووە، بەڵام وەک ئەم ڕیوایەتی فەرموودەی نەکردووە. بۆیە ئیمامی بەڕێز زۆرجار دەیووت خەڵکی گلەییم لێدەکەن کە من زۆر فەرموودە لە رسول اللەوە دەگێڕمەوە دەیان ووت: بۆچی (مهاجرین و أنصار) وەک ئەم نین!

لێرەدا خەڵک چۆن بڵێی بەگومانبوون چونکە دەیان ووت ئەم لە کۆتایی تەمەنی رسول الله موسڵمان بووە، کەچی ئەم هەموو فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، بەڵام خۆی وەڵامی داونەتەوە دەیوت من ئامادەبووم لەکاتی ئەوان ئامادەنەبوون و لەبەرم دەکرد لەکاتێکدا ئەوان بیریان دەچووە و (مهاجرین و أنصار) بەهۆی مەشغڵەتیان.

ئەم هاوەڵە لە پلە گەورەگانی نێو هاوەڵان نەبوو، چونکە صەحابیش چەندان پلەیان هەیە، لەوانە (سابقین الأولین) و ئنجا (عقبە) و ئنجا (بدر) و تا دوای سەلەف لەتەعریفی ئەم (إما) دەڵێن (من أحفظ الصحابی) نەک (أفضل).

ئەبو هرێرە بەهۆی حرصی یان پێداگری لە سەر فێربوونی عیلم و حەدیث هێندە ناسرا تا بەدەگمەن کۆمەڵی موسڵمان هەبێت ئەم هـاوەڵە نەناسێت کەچی هاوەڵی (سابقین الأولین) و (بدری) هەن زۆر کەم کەس دەیان ناسێت جگە لە طالب العلم. زۆرجار رسول الله کە پرسیاری لێ دەکرد دەیفەرموو وام نەدەزانی جگە لە تۆ کەسی تر ئەوەم لێ بپرسێت بەهۆی پێداگری لە فێربوون و حەدیث.

یەکێک لەو هاوەڵانەی زۆرترین دووژمنی هەیە، چونکە زۆرترین حەدیثی پاراستووە و بۆمانی نەقڵ کردووە. هەندێک دەڵێن دەگاتە پێنج هەزار! سبحان الله بەهۆی پێداگری و کردنە قوربانی کاتەکانی ژیانی

بۆ طلب العلم. ئێستا بۆته کۆڵەکەی دین ئەوەیە بەرزکردنەوە و سەلەف دەڵێن لەیەک ڕۆژدا دوانزە هەزار تەسبیحانی دەکرد.

ئەم هاوەڵە کاتێک دەچیتە نێو جیهانی حەدیث ئنجا تێدەگەی چۆن بووە لەنێوان هەر سێ فەرموودەیەک دەڵێت: عن أبی هریره الله لێی ڕازی بێت ئەوەیە قوتابی کە (خاتم الأنبیاء) ماموستات بێت.

لەپلەی یەکەمی هەموو هاوەڵانی ئیسلام دێت لە ڕیوایەتکردنی فەرموودە کە ژمارەی فەرموودەکانی پێنج هەزار و سێسەدی تێپەڕاندووە. لە ساڵی ٥٩ی هیجری کە خۆی دوعای کرد پێش ساڵی شەستەکان بمرێت رضی الله عنه.

## عبد الله بن عمر بن الخطاب (رضی الله عنهما)

یەکێکە لە فوقهایانی فەرموودە دوای ئەبوهرێرە زۆرترین فەرموودەی ڕیوایەت کردووە کە زیاترە لە دوو هەزار و شەش سەد فەرموودە. "عبد الله بن عمر بن الختاب" الله لە خۆی و باوکی ڕازی بێت یەکێکە لە هاوەڵە پلە بەرزەکان تا نەگەڕێیتەوە ناو حەدیث قەدری نازانیت.

له جەنگی (ئوحود)دا دەڵێت: پیشانی رسول الله دراوم ﷺ تەمەنم چواردە ساڵ بوو ڕێگای پێ نەدام بەڵام لە (خەندەق) ڕێگای پێدام".

ئنجا دوای ئەمە بەشداری زۆرینەی زۆری جەنگەکانی کردووە و هاوەڵی بەڕێز یەکێک بوو لەوانەی لەکاتی فیتنەکان تەرکی هەردوو لای کرد واتە ئیمامی "على" و "معاويه" و داوایان لێکرد کە بیعەتی پێ دەدەن و ببێتە ئەمیری ئیمانداران بەڵام ڕەتیکردەوە. لەساڵانی حەفتای هیجری بەدەستی حەججاج شەهید دەکرێت. لەناو هەر پێنج فەرموودە یەک إبن عمر الله لێی ڕازیبێت هەیە. یەکێک بوو لە عالیم و عابیدە هەرە بەرزەکانی نێو هاوەڵان والله أعلم. لە (صحيحين) واردە رسول الله فەرمووی: چاکترین عبد "عبدالله"یە ئەگەر شەو نوێژی بکردایە. ئنجا ڕاوی دەڵێت لەوکاتەوە عبدالله زۆر کەم شەوان دەنووست. سبحان الله والله رسول الله ڕاستیکرد کە فەرمووی: (خيركم قرنى) باشترین سەدە ئەوەی ئێستای منە.

## أنس بن مالك الأنصاري (رضى عنه)

پشتیوان بە الله لەچەند تیشک دەخەمە سەر هەندێک لە پایە و کۆڵەگەی دین و حدیث ناکرێت بچیتە نێو ئەم عیلمە ووردە و عالم و

فقيهەكانی نەناسين هەر لە هاوەڵان تا تابعين و دوای ئەوان گەر چی ناكرێت دانە بـەدانە باسيان بكرێت چونكە دەبێت بكرێتە چەند موجەلەدێك وەك كتێبە تأريخيە گەورەكانی سەلەف و خەلەف، بەڵام دەمەوێت جياوازی من ئەوەبێت لەگەڵ پێش خۆم من ئەو ئەركە بكێشم كە چەند دانەيەك لە هاوەڵ و لەتابعين و لە چينی دوای ئەوان بناسێنين كە گرنگە بۆ طالب العلم.

**"أنس بن مالك الأنصاري" رضی عنه.**

ناوی تەواو و كنيەی: "أنس بن مالك بن النضر بن ضمضم بن زيد ابن حرام بن جندب بن عامر بن غنم بن عدي بن النجار."

"أبو حمزة"، پێی دەڵێن "أبو ثمامة." الأنصاري النجاري خزمەتكاری رسول اللّٰه ﷺ وصاحبه. لەساڵی ١٠ ی پێش هجری لەدايك بووە[١].

هاوەڵی بەڕێز پێی دەڵێن من (صغار صحابی)وە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لەم هاوەڵە بەڕێزانە:

عَنِ: النَّبِيِّ ﷺ عِلْماً جَمّاً. وَعَنْ: أَبِي بكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، وَمُعَاذٍ، وَأُسَيْدِ بنِ الحُضَيْرِ، وَأَبِي طَلْحَةَ، وَأُمِّهِ أُمِّ سُلَيْمٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، وَخَالَتِهِ أُمِّ حَرَامٍ،

١ سەرچاوە/ (تأريخ دمشق إبن عساكر).

وَزَوْجِهَا عُبَادَةَ بنِ الصَّامِتِ، وَأَبِي ذَرٍّ، وَمَالِكِ بنِ صَعْصَعَةَ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَفَاطِمَةَ النَّبَوِيَّةِ، وَعِدَّةٍ.[١]

له رسول اللەوە ﷺ لەگەڵ بەشێکی زۆر لە کباری هاوەڵان و "خلفاء الراشدین". هاوەڵی بەڕێز "أنس بن مالك" دەڵێت، کاتێک رسول الله هاتە مەدینە من تەمەنم دە ساڵان بوو و کە وەفاتی تەمەنم بیست ساڵان بوو و لەوکاتیەوە خزمەتی رسول اللەم کردووە[٢].

هەروەها لە "صحیح بخاری"دا هاتووە، "أنس" رضی اللە دەڵێت، لە حازر و لە سفر لە خزمەتیدا بووم هەرگیز لەسەر شتێک کە نەمکردبێت پێی نەوتووم بۆ نەتکردووە یان شتێکم ئەنجامدابێت و پێم بڵێ بۆچی کردووتە. هەروەها دەڵێت دەساڵان خزمەتم کرد هەرگیز نە لێی داوم و نە خۆی لێ تووڕە کردووم و نە قسەی پێم ووتووە[٣].

هاوەڵی بەڕێز بە بنەماڵە یەکێکن لە بنەماڵە هەرە پلە بەرزەکانی أنصار هەم دایکی کە "أم سلیمی أنصاری" یە یەکێکە لە صەحابییە بەڕێزەکان و خاڵ و مامی "أنس" خاڵی شەهیدی بەڕێز "حرام بن ملحان" یەکێک لە شەهیدەکانی (بئری معونە) بوو کە قرائەکانیان پێ دەگوترا، لەگەڵ

---

١ سەرچاوە/ (سیر أعلام النبلاء للحافظ ذهبی).
٢ سەرچاوە/ "مسلم، أحمد" (سیر أعلام النبلاء للحافظ ذهبی)
٣ سەرچاوە/ (سیر أعلام النبلاء للحافظ ذهبی).

حەفتا هاوەڵی بەڕێز بەخیانەت شەهیدکران و مامی ئەوەی کە الله پێی فەرمووو قال الله تعالى: (من المؤمنون رجال صدقوا...).

أنس بن النضر" کە لە ئوحد شەهیدکرا و "عبادە بن الصامت" هاوەڵی بەڕێز و گەورە کە "بنت ملحانی" لابوو ئەو ئافرەتەی کە داوای لە رسول الله ﷺ کرد یەکێک بێت لە شەهیدەکانی یەکەم هێزی دەریایی موسڵمانان کە لە بەحر دەپەڕنەوە و داواکەی قبوڵ بوو.

"إبن عساکر" لە تاریخ لە "ئەباهورێر"ەوە رضی اللّه عنه ریوایەتی کردووە، دەڵێت هیچ کەسێکم نەدیووە نوێژی وەک نوێژی رسول الله تەواو بێت و لەو بچێت جگە لە "إبن أم سليم".

لەبخاری ڕیوایەتکراوە هاوەڵی بەڕێز "أنس" دەڵێت لە سفردا لەگەڵ "جرير بن عبدالله" بووم کە بەتەمەن لەو گەورەتر بوو، بەڵام خزمەتی "ئەنسی" دەکرد چونکە لە خزمەت رسول الله خزمەتکار بوونە.

یەکێکە لە عالم و فقیە هەربەرزەکانی ئوممەت. گەورەترین خزمەتی دینی کردووە بەتایبەت حەدیث بەجۆرێک "مسند أنس بن مالک" یەکێکە لە (مسند)ە گەورەکان و ژمارەی سەنەدی گەیشتووە ٢٢٨٦ فەرموودە. بۆیە تا نەچیتە نێو (علوم الحدیث) قەدری نازانیت بەجۆرێک لەنێوان چەند فەرموودەیەک و "أنس بن مالک" رضی اللّه عنه.

هەروەها لە "صحيح بخاری و مسلم"دا هاتووە کاتێک رسول الله ﷺ دەچێتە ماڵیان "أم سليم" دەڵێت، ئەی پێغەمبەری خوا کارێکی تایبەتم هەیە پێی ووت خزمەتکارەکەت "أنس" دوعای بۆ بکە ئەویش دوعای بۆ دەکات (اللهم أكثر ما له وولده وعمر)، خۆی "أنس" دەفەرمووێت والله ئێستا من نەوەی کوڕەکانم گەیشتوونەتە سەد و زۆرترین ماڵم هەیە و تەمەنیشم گەلێک زۆرە. بەڵێ تەمەنی هەندێک دەڵێن گەیشتە ١٠٧ ساڵ و هەندێکی دەڵێن ١٠٣ ساڵ کۆتا هاوەڵ بوو لە بەصرە وەفاتی کرد. کاتێک وەفاتی مرد گوتیان نیوەی عیلم مرد.

## عائشة بنت ابى بكر (رضى الله عنها)

دایکی ئیمانداران عائیشە، ناسینی ئەم کەسە بۆ موسڵمان زۆر گرنگە چونکە بەشێکە لەتەواوکەری دین لەدوای "أنس بن مالك" الله لێی ڕازی بێت، زۆرترین فەرموودەی گێڕاوەتەوە، کۆی گشتی زیاترە لە دوو هەزار فەرموودە.

یەکەم خێزانی رسول الله یە کە کچ بێت پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرمووێت لە خەوما لەنێو پارچە یەک لەپەڕۆ چەند ملائیکەتێک بۆیان هێنام. دەیان گوت ئەمە خێزانی دونیا و دوا ڕۆژتە کەسەریم هەڵداوە

بینیم، ئەمە پێش هیجرەت مارەی کرد، بەڵام دوای هیجرەت گواستییەوە. یەکێکە لەو کەسانەی کەوا بووختانی پێکرا کە مەشهورە بە (إفك). بەڵام الله تعالی لەسەرووی عەرشەوە پاکبوونی سەلماند. دە ئایەتی لەبارەوە بۆ دابەزی.

دوای وەفاتی پێغەمبەر هاوەڵان لەهەموو چینەکان دەهاتن پرسیاریان لێ دەکرد ئیمامی عمر و عثمان لە مەسائیلە تایبەتیەکاندا چونکە ئەم لەحوجرەی مزگەوت بوو، بۆیە زیاتر ئاگاداری باسەکان بوو.

رسول الله ﷺ دەیفەرموو: (فضل عائشة على سائر النساء كفضل ثريد على سائر الطعام).

وقال الزهري: (لو جمع علم عائشة إلى علم جميع النساء لكان علم عائشة أفضل).

واتە "ابن شهاب" دەڵێت گەربێت و عیلمی هەموو ئافرەتان و عیلمی "عائشە" کۆبکەیتەوە عیلمی "عائشە" لەسەرووی هەموویانەوە دەبێت.

قال الحاكم فيالمستدرك أن (مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَعْلَمَ بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ وَالْعِلْمِ وَالشِّعْرِ وَالطِّبِّ مِنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ).

واته ئەم بینووە کەسێک شارەزاتر بێت بە حەرام و حەڵاڵ و زانست و پزیشکی. لای شیعەی ڕافیزەش زۆر بووختانی بۆ دەکرێت و دووژمنیانە، بەڵام لای ئەهلی سونە بۆتە تەواوکەری بەشێک لە سونەت.

## عبدالله بن عباس (رضی الله عنهما)

یەکێک لە (مفسیر و محدث و فقیهی) ئوممەت. ئەم هاوەڵە بەڕێزەیە "ابن عباس" کە مەشهورە بە (حبر الأمە)، یەکێکە لە (صغار الصحابة). زۆرینەی ڕیوایەتی فەرموودەکانی لە هاوەڵە گەورەکانی وەک ابو بکر و عمر و هاوشێوەکانیەتی. رسول الله ﷺ دوعای بۆ کردووە (اللهم فقه فی الدین و علمه الکتاب) یان (تأویل).

لەکاتی سەرهەڵدانی خەوارج چوو بۆلایان و دەعوەی لەگەڵ کردن سێ هەزار لەم کات گەڕانەوە. تەفسیری دوای "ابن مسعوود"ە بەڵام لەبەرئەوەی زیاتر لە چل ساڵ دوای "ابن مسعوود" ژیاوە بۆیە یەکێکە لە موفەسیرە هەرە گەورەکانی ئەم دینە و جگە لەوەی لە (حدیث)دا پێشەنگی زۆرینەی زۆری هاوەڵانی گرتووە دوای "عائشە" زۆرترین ڕیوایەتی هەیە کە دەگاتە زیاتر لەهەزار و شەش سەد فەرموودە. تەنانەت ئیمامی عمر لە زۆرینەی پرسە گەورەکان پرسی پێدەکرد.

ابن عمر دەڵێت: "هیچ کەس شارەزاتر نییە وەک ابن عباس بەوەی بۆ رسول الله دابەزیووە مەبەست قورئانە".

"مجاهد" دەڵێت "ابن عباسم" دەبینی تەفسیری قورئانی دەکرد وەک بڵێیت نوری لێدەردەچوو. هاوەڵان و تابعین وەسف و پێداهەڵدانییان گەلێک زۆر بووە بۆ ئەم هاوەڵە بەڕێزە.

## جابر بن عبدالله الأنصاری

یەکێکی تر لە فوقەهایانی حەدیث هاوەڵی بەڕێز جابرە کە کوڕی عبدالله بوو کە باوکی یەکێک بوو لە (بدری و سابقین) و لە (ئوحد) شەهید بوو کە الله تاکە عەبد بوو بێ پەردە قسەی لەگەڵ کردووە دوای مردنی هەندێک ڕیوایەت دەڵێن نۆ هەندێک دەڵێن شەش کچی جێهێشت لەگەڵ قەرزێکی زۆر.

کاتێک دەچێتە خزمەت (صحیح وسنن و مسند)ەکان بەڕێژەی زۆر دەکەوێتە بەرچاوت (عن جابر) بەشداری جەنگی (خەندەق) و (خەیبەر) و زۆرینەی جەنگەکانی کردووە. تەنانەت لە (صحیحین) دا واریدە دەڵێت لە (خەندەق) رسول اللهم بینی برسییەتی زۆری بۆ هێنابوو. چوومەوە ماڵ و بە خێزانم ووت چیمان هەیە، ئەمیش گووتی هەندێک ئاردە نان و

بەرخێک یان کاوڕێکی بچووکی یەک ساڵ نەبوو. ئنجا هاتمەوە لای رسول الله بە بێدەنگی ووتم تۆ و هاوەڵێتکت وەرن. رسول الله ﷺ فەرمووی با دەست لەهیچ نەدەن تا خۆم دێم هاواری کرد ئەی ئەهلی (خەندەق)، "جابر" خواردنی ئامادەکردووە. ئنجا لەکۆتاییدا ئەم کەمە خواردنە بەشی هەموو ئەهلی (خەندەق)ی کرد کە سەدان کەس دەبوون.

ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە: (مسند أحاديثه ١٥٤٠ حديث اتفق له البخاري ومسلم على ٥٨ حديث، وانفرد له البخاري بستة وعشرين حديثًا، ومسلم بمائة وستة وعشرين حديثًا).

لەساڵانی حەفتای هیجری وەفاتی کرد.

# پەیامی کۆتایی

(علوم الحديث) هێندە قوڵە قوڵاییەک زۆر کەم کەس سەری لێدەردەچێت. مەرج نییە کە فەرموودەیەکت بینی و تەواو ببێتە بەڵگە، بەڵکو دەبێت زیاتر لێی ووردبیەوە و هەدەف و ناوەڕۆکی بزانیت. بۆنمونە، فەرموودەیەکمان هەیە لە دایکمان "عائیشە"وە الله لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت: بە رسول الله ﷺم وت خەڵکی پێیان وایە جیهاد باشترینە. ئەویش فەرمووی: چاکترن جیهاد (حج المبرور) حەجێکی قبووڵکراوە.[١]

گەربێتو ئەم فەرموودەیە بە ظاهیری وەربگرین، ئەوا ئوممەتی محمد پشت لە جیهاد دەکەن وەک ئێستا کە کردوویانە. هەرچی فەضڵ و پلەی جیهادە نامێنێت. لەکاتێدا دەفەرمووێت: (مثل المجاهد كمثل الصائم القائم).[٢]

بەڵام هەمان فەرموودە لە بابەکانی تردا تەفاصیلی پێدراوە. بۆنمونە، هەر لە "بخاری"وە دیسانەوە دایکمان عائیشە دەڵێت: هەندێک لە ئافرەتان داوای ڕێگەپێدانی جیهادیان کرد لە رسول الله ئەویش پێی ووتن (جهاد كن حج). واتە جیهادی ئێوە حەججە. کەواتە ئێستا بۆمان

---

١ صحيح بخارى

٢ صحيح مسلم

ڕوونتربووه كه مەبەستی لەگەڵ ئافرەتانه. دیسانەوه هەمان فەرمووده له بابێكی تری جیاوازەوه ئەم جاره به ئافرەتان دەفەرمووێت: (نعم الجهاد حج مبرور).[1]

كەواته كه فەرموودەیەك دەبینیت لەوانەیه له پەنجا شوێن به ڕیوایەتی جیاواز هاتبێت. بۆنمونه له شەرحی (فتح الباری)دا شێخ "إبن حجر العسقلانی" كاتێك ئەم فەرموودەیەت بۆ شەرحدەكات دێت لەسەرجەم بابەكانی كه هاتووه و لەگەڵ سەرجەم (صحیح و سنن و مسند)ەكان باسی دەكات. ئنجا وەڵامەكەیت پێ دەڵێت، بۆیه چۆن قورئان بێ تەفسیر تێی ناگەیت. فەرموودەش بێ شەرح لێی حاڵی نابیت.

ئەم نمونەم بۆیه بۆ باسكردن چونكه دەمەوێت سەرنجتان بۆ لای ئەوه ڕابكێشم كەوا حەدیث زۆر ئاڵۆزه تا نەگەڕێیتەوه بۆ شروحات باش لێی حاڵی نابیت. باشترین شروح بۆ "صحیح بخاری" بەناوی (فتح الباریه) كه حافظ "ابن حجر العسقلانی" نوسیوویەتی كه یەكێكه له پێشەوایانی حەدیث. هەندێك له زانایانی به (امیر المؤمنین) له له حەدیث وەسفی دەكەن. ئەم شەرحەی بەناوی (فتح الباری) به ٤٥ ساڵ نوسیووه. بەڵام چاكترین شەرحه بەجۆرێك له شەرحی فەرموودەیەك چەند ڕیوایەت

١ صحیح بخاری

کرابێت لەچەند شوێن هەمووی باسدەکات و شیکاری وردیشی بۆ دەکات کە زیاتر لە دە بەرگە.

دووەم شەرح بۆ (صحیحی مسلم) شەرحی زۆر کراوە، بەڵام چاکترینیان "إمامی نووی" بۆی کردووە بەناوی (منهاج). لەشەرحی فەرموودەکان مەسائیلە فقهی و ئیختلافاتییەکانت بۆ ڕووندەبێتەوە.

ولله الحمد والمنە لێرەوە کۆتایم بەم کتێبە هێنا کە هەوڵمدا بەپووختی و بە شێوازی جیا باسی ئەم عیلمە زۆر گرنگ و زۆر هەستیارە بکەم.

**والحمد لله رب العالمین.**